


# ئافرەتانی

## دەوری پێغەمبەر ﷺ

نووسینی: عبدالرحمن رأفت پاشا

وەرگێڕانی: مونیرە ڕەئوف واژەیی



ناوی کتێب: ئافرەتانی دەوری پێغەمبەر (ﷺ)

نووسینی: د. عبدالرحمن رأفت باشا

وەرگێڕانی: منیرە ڕەئوف واژەیی

نەخشەسازیی : ناوەندی سارا ( هونەر عوسمان)

قەبارە : (١٤*٢١)، ١٢٢ لاپەڕە

نۆبە و ساڵی چاپ: چاپی دووەم/ ٢٠١٨

شوێنی چاپ : ناوەندی سارا _ سلێمانی

تیراژ: ٥٠٠ دانە

نرخ : ٣٠٠٠ دینار

---

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارەی سپاردن (١٥٧٤)ی ساڵی ٢٠١٠ ی پێدراوە

ئافرەتانی دەوری پێغەمبەر (ﷺ)




ناوەندی سارا
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی_بازاڕی ئاوباریک
٠٧٥١ ٥٢٨ ٣٥٠٥

# پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحیم

سوپاس و ستایش بۆ خوای میهرەبان و دلۆڤان، درود و سەلامی خوا لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەر و یارانی.

هەرکات خوای گەورە پەیامبەرێکی ناردبێت مرۆڤەکان لە بەرامبەردا بوونە دوو دەستە، دەستەیەکیان پەپولەئاسا لە دەوری شەمع و نوری پێغەمبەرەکە جەم بوون و لەو نورە خواییە بەهرەوەر بوون، سەرەنجام ژیانیان پڕ لە داستان و مەردایەتی کردو ناوی خۆیان بە زیندوویی هێشتەوە.

دەستەی دووەم کە بە سروشت حەزیان بە تاریکی و ناڕونی هەیە، بە نووری نبوەت قەڵس و بێزار و ماندوو بوون، بۆیە کەوتنە دژایەتی و دوژمنایەتی پەیامبەرانی خوا، سەرەنجامیش لە دنیا مایە پوچ و لە دوا ڕۆژیش چارەڕەش بوون.

پێغەمبەری ئیسلام کە خوای گەورە ڕەوانەی کرد و دوایین پێغەمبەرە، کۆمەڵێك حەواری و پشتیوان و لایەنگر و عاشق و فیداکار و دڵسۆزی لەدەور کۆبونەوە، ئەو بووە چرا و ئەوانیش پەروانە، ئەو بووە ئاو و ئەوانیش بوونە ماسی ناو ئەو دەریایە، ئەو بووە خۆر و

ئەوانیش بوونە مانگ‌و ئەستێرە، مەحوی ئاسا کە دەڵێت: ﴿بە نوری عەکسی پێغەمبەر ئەوەندە مونعەکیس بوبوون غەریبی تازە هاتوو دەیوت ئەم پێغەمبەرستانە﴾.

ئەوە تەنها پیاوان نەبوون مێژویان بۆ خۆیان تۆمارکرد، نەخێر ئافرەتانی دەوری پێغەمبەریش ﷺ شان بە شانی براکانیان لە خزمەت پێغەمبەردا ژیان‌و بۆ پەیامەکەی بوون خزمەتکار، بەڵکو ئەوان بوونە دایەن‌و دایك‌و پور و هاوسەر و خوشك، بوونە لانکەی پەروەردەکردنی پێغەمبەر ﷺ بە شیری خۆیان گۆشیان کرد، هەروەك (حەلیمەی دایکی شیری) بە ماڵ‌و سامانی خۆیان بەرگریان لێکرد، بوونە هەڵگری فەرموودەکانی، نەوەکانی خۆیان لەسەر تێکۆشان‌و خەبات بۆ سەرخستنی پەیامەکەی محمد ﷺ پەروەردە کرد، خوای گەورەش لە ڕیزی خواناساندا تۆماری کردن، بوونە مایەی سەربەرزی بۆ ئافرەتانی دوای خۆیان، قوتابخانەیەکیان بۆ خوشکان‌و دایکان‌و ئافرەتانی پاش خۆیان دروستکرد، نمونەیەکی جوانیان پێشکەشکرد.

ئەم پەڕاوەش ژیان‌و تێکۆشانی مشتێ لەو خانمانە دەخاتەڕوو کە لە مزگەوتەکەی پێغەمبەر و زانکۆکەی مەدینەدا شەهادەیان وەرگرتووە.

بەئومێدی سودمەندبوونی خوشکانمان لە ژیانو بەسەرهاتیان،
دەستخۆشی بۆ دادە (منیرە رۆوف) کە ئەم پەڕاوەی بە کوردی کرد،
خامەیان ڕەنگینو ماندوبونیان لای پەروەردگار وەرگیراو (قبولْ) بێت.
والسلام عليكم و رحمة الله

مامۆستا ناصح محمد موبرەیی

٢٠١٠

## ﴿حليمەی سعدی﴾

دایکی شیریی پێغەمبەری خۆشەویست محمد (ﷺ)، ئەم خانمە هێمن و لەسەرخۆیە، بەڕێز لای هەموو موسڵمانێك، خۆشەویست لای هەموو ئیمانداریك، لەمەمکە پاك و بێ گەردەکانی شیری دا بەمناڵی پایەبەرز محمدی کوڕی عبدالله (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) لەسەر سنگی پڕ لەخۆشەویستی سەرخەوی ئەشکاند لەلانەی لێوان لێو لەسۆزیا گاگۆلکێی کرد، لە زمانپاراوی ئەو و زمانپاراوی هۆزەکەی بني (سعد) پاراو بوو، کە لەهەموو قسەڕونەکان قسەڕوونتر بوو، وتەکانی لەهەموو ڕەوانبێژەکان ڕەوانتر بوو، ئەم خانمە بەڕێزە حەلیمەی سەعدی دایکی پێغەمبەرمان محمدە (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) لەشیرەوە، بەشیردانی خانمی سەعدی بەم مناڵە بەڕێزە دنیای پڕکرد لە ئەوپەڕی چاکە و بەزەیی ....

بەخێرو چاکە و ڕێنوێنی ئاوەدانی کردەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بە ئاکاری شیرین و جوان ڕازاندیەوە،

چـیرۆکێك لەخۆشـترین چـیرۆکەکان حەلیمـەی سـەعدی بەدەربڕینـە ڕۆشـن و ڕێـك وپێـك و سـەرنج ڕاکێشـەکانی وە بەشێوازە درەوشاوەو قەشەنگ و شیرینەکەی ئەیگێڕێتەوە ، وەرن باپێکەوە گوێ ی لێ بگرین ....

کـە چـیرۆکەکەی لای پێغەمبـەری خـوا (درودو سـەلامی خـوای لەسـەر بێـت) لەخۆشـترین چـیرۆکەکانە ، حەلیمـەی سـەعدی ئـەڵێت : مـن و هاوسـەرەکەم[1] لـەماڵ دەرچـوین بـۆ ئـەوەی منـاڵێکی بچووك بگرینـە خۆمـان کـە شـیرەخۆرە بێـت ڕۆیشتین بەرە و مەککە لەگـەڵمانا هەنـدێك ژن لـە هـۆزی بـەنی سەعد هەبوو کە ئەوانیش بۆ هەمان مەبەست هاتبون وە ئەمە لەساڵێکی بێ بارانی و بێ دەرامەتیا بوو ......

تۆو وشك بوو......

گـوانی حەیوانـەکان پـەکیان کـەوتوو هـیچ شـتێکمان بـۆ نەمایـەوە دوو وولاّخـی پـیری لاوازمـان پـێ بـوو کەیـەك قـەترە شیر لەگوانیانـدا نـەبوو مـن و کوڕەبچوکەکەم سوار یەکێکیان بوین بەلاّم هاوسەرەکەم سوار حوشترەکە بووبوو کە لەوەکـەی

---

١ ــ هاوسەرەکەی ( حارثی کوڕی عبدالحزن ی سعدی ) بوو

ئێمە پیر تر و لاوازتربوو سوێند بەخوا ئەوشەوە ئێمە هەتا بەیانی لەبەر گریانی منالەکەمان کە لەبرسا ئەگریا نەخەوتین چونکە نەمن شیر لەمەمکمدا هەبوو نەحوشترەکە شیر لە گوانیدا هەبوو هەتامندالەکەی پێ تێربکەین ئێمە بەهۆی لاوازی و بێ هێزی ولاخەکانمانەوە هێواش ئەڕۆشتین کەبوە هۆی هەراسانکردنی هاوڕێکانمان و سەفەرەکەیان لەسەر قورس بووبوو کاتێک گەیشتینە مەککە و بۆ مندالی شیرە خۆرە گەڕاین توشی شتێك بوین کەچاوەڕوان نەئەکرا.....

ئەویش ئەوەبوو کەهیچ ژنێك نەما مندالێکی بچوکی بۆ نەهێنن بەناوی (محمد کوڕی عبدالله ) بەلام هیچ کاممان وەرمان نەگرت لەبەر ئەوەی هەتیو بوو .

ئێمە ئەمان ووت : چی سودێکمان پێ ئەگەیەنێت دایکی مندالێك کەباوکی نی یە ؟! پاشان تەنها دوو ڕۆژ زیاتر بەسەرمان تێنەپەڕی کە هەریەکێك لە ژنەکان مندالێکی شیرەخۆری دەست کەوت ..

بەلام من کەسم دەستنەکەوت کاتێك بەتەواوی بڕیاری ڕۆیشتنماندا بەهاوسەرەکەمم ووت: من پێم ناخۆشە بڕۆمەوە

بـۆ مالـەوە و بۆنـاو هۆزەكـەم بەدەسـتی بـەتاڵ بێئـەوەی شـیرەخۆرەیەكم دەسـتكەوتبێت هـیچ كەسـیش لـە ژنـە هاورێكانم نـەماوە شیرەخۆرەی لەگەڵ نەبێت. سوێند بەخوا ئەچم بۆلای ئـەو هـەتیوە و ئـەیهێنم هاوسـەرەكەم پێـی ووتم : باشـە بیهێنـە بـەڵكو خـوا بـەخێری بگێڕێـت ڕۆیشـتم بـۆلای دایكـی و هێنـام ... سـوێند بەخوا هـیچ شـتێك وای لێنـەكردم كەبیهێنم تەنها ئەوە نـەبێت كـەمن لەئەو زیـاتر منـداڵم دەسـت نەكـەوت . كردمـە باوەشـم و هێنامـەوە بـۆ لای كاروانەكـە، مەمكم خستە دەمیەوە شیریان تێهات بەویسـتی خـوا ژیانـەوە دوای ئـەوە كەوشـكیان كردبـوو هیچیان تیانـەبوو منداڵەكـە خواردی هەتا تێر بوو ئینجا براكەشی خواردی هـەتا ئەویش تێر بوو پاشان نووستن من و هاوسەرەكەشم لە تەنیشتیانەوە ڕاكشاین بخـەوین چونكە كەمێك نـەبێت نەخـەوتبوین بـەهۆی گریـانی منداڵەكەمانـەوە پاشـان هـەر لـەو كاتـەدا هـاوارم لـە هاوسـەرەكەم كـرد كـە ئـاوڕ بداتـەوەو سـەیری حوشـترە پـیرە لاوازەكـە بكـات ...كـە گوانـەكانی پڕبـوو بـوون لەشـیر بەسـەر سـوڕمانەوە چـوەلای، بـاوەڕی بەچـاوەكانی خـۆی نـەدەكرد

شیرەکەی دۆشی و خواردیەوە. پاشان شیری بۆ من دۆشی و خواردمانەوە هەتا تێر و پڕبووین ئەوشەوە لە چاکترین شەوی ژیانماندا خەوتین کاتێك بەیانیمان لێهات هاوسەرەکەم وتی: ئەی حەلیمە ئەزانی تۆ بویتە دایەنی منداڵێکی پیرۆز ؟! پێم ووت : بەڵێ وایە هیوادارم خێری زۆری بۆمان هەبێت پاشان لە مەککە دەرچوین سواری ماکەرە پیرەکەمان بووم ... منداڵەکەم لە گەڵ خۆما هەڵگرت وڵاخەکە ئەوەندە گورجوگۆڵ و چالاك بوو پێش هەموو وڵاخەکانی قەومەکەم کەوت بەجۆرێك هیچ کام لەوڵاخەکانیان پێی نەئەگەیشتنەوە تاوای لێ هات ژنەکانی هاورێم ووتیان : بەلاّ لێت دا کچی (ابي ذؤيب) ، هێواش برۆ لەبەر ئێمە ئایە ئەمە ماکەرە پیرەکە نیە کە پێی هاتن ؟!!

پێم ووتن : بەڵێ ... سوێند بەخوا ئەوە. ووتیان : سوێند بەخوا شتێك هەیە پاشان گەیشتینە ماڵەکەمان لەناوچەی (بَني سَعْدِ) هیچ زەویەك نازانم لەزەوی خوا کە لەو زەویە وشکترو ڕوتەنتر بێت کەچی مەڕەکەمان لە گەڵ هەموو بەیانیەك بەرە و ئەوێ ئەڕۆیشتن تیای ئەلەوەڕان و لەگەڵ

ئێـواره ئەگەڕانـەوه ئـەمان دۆشـین پـاك و بێگـەردی بۆخـوا چ دۆشـینێك؟! لـه شـیرەکەمان ئـەخواردەوه چ خواردنەوەیـەکی خـۆش! ، هـیچ کەسـێك جگـه لەئێمـه یـەك دڵـۆپ شـیری لەمەڕەکـەی نەئەدۆشـی. ئەمـه وایکردکـه هـەموو هۆزەکـەم بەشوانەکانیان ئەووت : بەلآ لێتـان بدات ... مەڕەکانتان لـەو لەوەڕگایه بلـەوەڕێنن کـه شوانەکەی کچـی (أبي ذُؤیـب ) ئـەی لـەوەڕێنێت ئـەوەبو مـەڕەکانیان لـەدوای مـەڕەکانی ئێمـەوه ئەلەوەڕانـد تـەنیا ئـەوەبوو بەبرسـێتی ئەگەڕانـەوه و یـەك دڵۆپیـان تیانـەبوو. بـەردەوام خێـر و بەرەکـەتی خوامـان بـه سەردا ئەڕژا تاکو دووساڵی شیردانی منداڵەکه تـەواو بوو وه بەتـەواوەتی لەشـیر بڕایـەوه لـەو دوسـاڵەیا گەشـەکردنێك گەشەی کرد کەبەراورد نەئەکرا لەگەڵ هاوشێوەکانی ... ئـەو دوسـاڵی تـەواو نـەکردبوو لای ئێمـه کەمنـداڵێکی بـەهێزو تـەواوی لێـدەر چـو بـوو لـەو کاتـه واتـه دوای دوو سـاڵەکه بردمانـەوه بۆلای دایکـی ئێمـه زۆر سوربوین لەسـەر ئـەوەی لای خۆمـان بیهێڵینـەوه و هەتاهەتایـه لای خۆمـان بێـت، لەبەرئەو بەرەکەتەی کـەتیایا بینیبومان، کاتێك دایکیم بینـی

دڵنیـــام کـــردو پـــێم ووت: بۆچـــی کوڕەکـــەم لای مـــن بـــەجێ ناهێڵێـت تـا زمـان پـاراوتر و بـەهێزتر بێـت ... مـن ئەترسـم کەتووشی پەتاو نەخۆشی مەککە بێت وازم لێ نەهێنا تاڕازی بوو کە حەزکات لەگەڵمانا بینیرێتەوە هێنامانەوە زۆر دڵخۆش و گەشـبین بـوین. پاشـان هـەمووی چـەند مانگێـك بەسـەر هێنانەوەی منداڵەکە تێنەپەڕی کەشتێك ڕویـدا زۆر ترساین و دڵە ڕاوکێمان پێ کەوت ... ئەو ڕوداوە ڕای چڵەکاندین چۆن ڕاچڵەکاندنێك : ئـەو بەیانیـە لەگـەڵ براکـەیا ڕۆشـتە دەرەوە بۆلای مەڕەکان کەلەپشت ماڵەکەی خۆمانەوە ئەیان لەوەڕاندن زۆری پێ نەچو کەبراکەی هاتەوە بۆلامان و ووتـی: فریـای بـرا قوڕەیشیـەکەم بکـەون، دوو پیـاوی بـەرگ سـپی بردیـان ڕایـان کێشاو سنگیان لەتکرد، من و هاوسـەرەکەم بەخێرایی چوین بـۆلای منداڵەکـە ڕەنگـی تێـك چـوبوو ئەلـەرزی هاوسـەرەکەم گەیشتە لایی و بۆی هێنـام نوساندم بەسـنگمەوەو پـێم ووت: چیتە کوڕم ؟!!! ووتـی: دووپیاوی بەرگ سپی بۆم هاتن ڕایـان کێشام سنگیان لەتکردم، شتێکیان لێدەرهێنا، نازانم چی بوو دوایـــی بەریانـــدام و ڕۆیشـــتن. منداڵەکـــەمان هێنایـــەوە زۆر

پەشۆکابوین و ئەترسـاین، کاتێـك گەیشـتینە خێوەتەکـەمان هاوسـەرەکەم کە چاوەکانی فرمێسـکی پیا ئەهاتە خـوارەوە، هاتـە لامـەوە و پاشـان ووتـی: ئەترسـم ئـەم منداڵـە پـیرۆزە تووشــی شــتێك بێـت کەنــەتوانین بــەرەنگاری ببینــەوە .... ئەیبەینـەوە بـۆ لای هۆزەکـەی ئـەوان لـە ئێمـە بـەتواناترن بـۆ ئـەوە . منداڵەکـەمان هـەڵگرت و ڕۆیشـتین هـەتا گەیشـتینە مەککە، چووینە مـاڵی دایکـی، کاتێك بینینـی لـە ڕوخسـاری کوڕەکەی ڕوانـی ئینجا بەپەلە پێـی ووتم : ئەی حەلیمـە چـی وای لــیٚ کــردی کــە محمــد بهێنیتــەوە کــەتۆ زۆر ســوربوی لەسەری ؟!زۆر حـەزت ئەکرد لـەلات بێـت ووتم : تـەواو لەشـی بەهێز بـووەو زمـانی پـاك بۆتـەوە وە ئەوەی کەلەسـەر من بـوو بۆئــەو تــەواوبووە، ئەترســم کارەســاتێکی لێڕوبــدا، بــۆم هێنایتـەوە ووتـی : هەواڵـە ڕاسـتەکەم پێبڵـیٚ نابێـت تۆلەبـەر ئـەوەی کەباسـت کـرد ئـەم کـوڕەت نـەویٚت پاشـان پێـداگری کـردوو وازی لێنــەهێنام هــەتا ڕاسـتیەکەم پـیٚ ووت دایکـی هـێمن بـووەو ووتـی: ئـەی حەلیمـە ئایـە لەبەرشـەیتان لێـی ئەترسی پێم ووت: بەڵیٚ ووتی: نەخێر سوێند بەخوا ڕێگایەك

نیە بۆ شەیتان دڵنیابە ئەم کوڕەی من پلە و پایەیەکی هەیە ... ئایە هەواڵێکت پێ ڕابگەیەنم؟

وتم : بەڵێ.

وتـی: کاتێـك لەسـکمابوو بینـیم نورێـك لەمنـەوە دەرچـوو کۆشـکی (بُصـرَی)ی لـەوڵاتی شـام بـۆ ڕونـاك کردمـەوە ئەوکاتـەش کەلـەدایك بوو دەستی لەسەر زەوی داناو سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە ... ئینجا وتـی : لەبەر خـۆت لێـی گـەڕێ بـڕۆ و ئاگاتـان لـەخۆتان بێـت خـوای گـەورە پاداشـتی خێـرت بداتـەوە بـۆ ئـەو چاکەیەی لەگـەڵ ئێمـە و ئـەم منداڵـە کـردت، مـن و هاوسـەرەکەم ڕۆیشـتین زۆر غـەمبار بـووین بـۆ جیابونـەوەی، کوڕەکـەشمان لـە ئێمـە خـەمی کـەمتر نـەبوو خـەمی دابڕانـی ئـەو سـوتاندبووی......... لەدواییـدا......... حەلیمـە سـەعدی تەمـەنێکی زۆر ژیـا چـوو بەسـاڵا بینـی ئـەو منداڵـەی کەشـیری پـێ ئـەدا ئـەمڕۆ بـۆ عـەرەب گـەورە و بـۆ ئادەمیزاد ڕێنیشـاندەر و بۆ مرۆڤایـەتی پێغەمبـەرە حەلیمـەی سـەعدی دوای ئـەوەی کـەئیمانی پێهێنـا و ئـەو کتێبـەی بەڕاسـت زانـی کـەبۆی هـاتووە چـو بـۆلای پێغەمبـەری

خـوا(درودی خـوای لەســەر بێت)کاتێـك پێغەمبــەر (درودی خوای لەسەر بێت) چاوی پێـی کـەوت خـەریك بـوو لەخۆشـیا ئـەفڕی دەسـتی کـرد بە (دایکـە ...دایکـە) عەباکـەی خـۆی بـۆ داکەندوو لەژێر پێیا ڕایخست بەخێرهاتنی کرد و بەجوانترین شێوە پێشوازی لێکرد هاوەڵان لێیان ئەڕوانین کە چ خۆشـی و امەرانیـەك باڵی بەسـەرا کێشاون درودو سـەلامی خـوا لەسـەر محمدی پاکی وەفـادار خـاوەنی ڕەوشـتی بـەرزو بـەڕێز ،ڕەزای خـوا لـە حەلیمـەی سـەعدی دایکـی شـیری پێغەمبـەری مـەزن (درودی خوای لەسەر بێت) .

## ﴿صەفیەی کچی عبدالمطلب﴾

((صەفیە یەکەم ئافرەتی موسڵمانە لەپێناوی بەرگریکرن لەدینی خوا بتپەرستی کوشتووە)) کێیە ئەم خانمەی کە پارچەیەکە لەڕەسەنایەتی و لەسەرخۆیی ئەو ئافرەتەی کەحسابی هەزار کەڵەپیاوی بۆئەکرا کێیە ئەو ئافرەتە هاوەڵە نەبەردەی کەیەکەم ئافرەتە لەئیسلامدا بتپەرستی کوشتووە؟

ئەو ئافرەتە بەجەرگە کێیە کەیەکەم سوار بوو شمشێر هەڵکێشانی بۆ موسوڵمانان دامەزراند لەپێناوی دینی خوادا؟ ئەوە صەفیەی کچی عبد المطلبي هاشمی قورەیشە پوری پێغەمبەری خوایە (درودی خوای لەسەر بێت) خانەدانی لەهەموو لایەکەوە دەوری صەفیەی کچی عبدالمطلبي دابوو : باوکی عبدالمطلب ی کوڕی هاشم باپیری پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێت) وە سەرداری قورەیش و سەرۆکی گوێلێگیراویان بوو دایکی هالەی کچی وەهەب خوشکی ئامینەی کچی وەهەب دایکی پێغەمبەری خوا محمد بوو (درودی خوای لەسەر بێت) هەروەها هاوسەری یەکەمی

حـارثـی کـوڕی حـەرب بـرای أبـو سـفیانی کـوڕی حـەربی سەرداری بەنی (ئومەییە) بوو لەلای بوو تاکۆچی دوایی کرد، هاوسەری دووەمی عەووامی کوڕی خوەیلید برای خەدیجەی کچی خوەیلید کەگەورەی ئافرەتانی عەرەب بوو لەسەردەمی نەفامیدا، یەکەمین دایکی ئیمانداران بوو لەئیسلامدا .

کوڕەکـەی زوبـەیری کـوڕی عـەووامی هـاوەڵی نزیکـی پێغەمبەری خوا بوو (درودی خوای لەسەر بێت) ئایە لەدوای ئـەم هـەموو پایەبەرزییـە پایەیـەك هەیـە دەرون داوای بکـات جگە لەپایەی ئیمان ؟!

هاوسەرەکەی عەووامی کوڕی خوەیلید کۆچی دوای کردو منـداڵێکی بچـوکی بـۆ بەجێهێشـت کەزوبـەیر بـوو لەسـەر ئازایـەتی و سـەختی گـەورەی کـرد .... لەسـەر سـوار چاکی و شـەڕ پـەروەردەی کـرد .... وای لێکـرد یـاریکردنی ببێتـە تیـژکردنی تـیر و چاککردنی کـەوان، فێـری کـرد کـە لەهـەموو ترسـانێکدا بیهاوێـت و تـیر بکاتـەوە کەوانەکـەی بـۆ هـەر مەترسییەك ئەگەر بیبینیایە دوودڵ ئەبێ یان ئەکشێتەوە بە لێـدانێکی زۆرتونـد لێـی ئـەدا هـەتا لەلایـەن یـەکێك

لەمامەکانیـەوە سەرزەنشـت کـرا لەسـەر ئـەوە کاتێـك کـەپێی ووت: ئـەوە چ لێدانێکـە لـەو کـوڕەی ئـەدەیت لێـدانێکی زۆر ڕقاوییە لێدانی دایك نی یە.

صەفیە بەشیعرێك وەڵامی دایەوە کەئەڵێت :

کێ ئەڵێت ڕقم لێیەتی درۆی کرد

بۆیـە لێـی ئـەدەم زرنـگ و کۆڵنـەدەربێت، سوپابشـکێنێت و دەستکەوت بهێنێت

ئەوکاتـەی خوا پێغەمبـەری بەئاینی ڕاسـت و ڕێنیشـاندەر ڕەوانەکرد وە ناردی تـا ترسێنەرو مژدەدەربێت بۆخـەڵکی وە فەرمانی پێکـرد کە لەخزمـە نزیکەکانیـەوە دەسـت پـێ بکـات، نـەوەی عبـدالمطلبی کـۆکردەوە بـەپیاو و ژن و گـەورە و بچوکیانەوە پێـی فـەرمون: ئـەی فاطیمـە ی کچـی محمـد، ئـەی صەفیەی کچی عبدالمطلب، ئەی نەوەی عبـدالمطلب مـن هـیچ شتێکم لای خوا پێ ناکرێـت بـۆ ئێـوە پاشـان بـانگی کـردن بـۆ باوەڕهێنـان بەخوا، وە هانیـدان بۆ بەڕاستدانانی پەیامەکەی پاشـان هەرکـەس ڕونـاکی خـوای وەرگـرت وەری گـرت هەرکەسێکیش پشـتی لـەو نـورە کـرد پشـتی تێکـرد ئـەوە بـو

صـــەفیەی کچـــی عبـــدالمطلب بـــوە دەســـتەی ئیمانـــدارە پێشەنگەکان کەباوەڕیان پێ کرد ئەو کات صەفیە شکۆداری لە چواردەوری خۆی کۆکردەوە، پایەبەرزی وەجاخ زادەیی و شـکۆی ئیسـلام، صـەفیەی کچـی عبـدالمطلب و کوڕەکـەی زوبـەیری کـوڕی عـەووام چـوونە نـاو کـاروانی ڕوناکییـەوە، لەهـەموو ئەو ستەم و ناڕەحەتیانەیان چەشت کە موسڵمانە پێشـەنگەکان بەدەستی قوڕەیش چەشتیان، کاتێك کەخوای گەورە ئیزنی بە پێغەمبەر و ئیماندارەکانـدا کە کۆچ بکـەن بۆ مەدینـــە ئـــەم خانمـــە هاشمیـــە مەککـــەی لـــەدوای خـــۆی بەجێهێشت بەهەموو یادەوەریـە خۆشـەکانیەوە، هـەموو ئەو شوێن و پێگەیەی کە جێگەی فەخرو شانازی بوو بەجێهێشت و ڕووی کـــردە مەدینـــە بـــە ئاینەکەیـــەوە بـــۆ لای خـــواو پێغەمبەرەکەی کۆچی کرد .

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەم خانمە گەورەیـە لـەو ڕۆژانـەدا پێی نابوە نزیکەی ٦٠ساڵی تەمەنی درێژی پڕ خێریەوە .

لــــەگۆڕەپانی تێکۆشـــان لـــەپێناوی دینـــی خـــوادا هەڵوێستەکانی هەتا ئێستا مێژو بە زمانێکی تەڕ و پاراو بە سەرسوڕمان و ستایش کردنەوە ئەیگێڕێتەوە .

لێرەدا تەنیا باس لەوێنەی دوو هەڵوێستیان ئەکەین :

کـە یەکـەمیان ڕۆژی (اُحـد)ە و دووەمیـان ڕۆژی (خەنـدەق)ە ئـەوەی لـە ئوحـد ڕویـدا ئـەوەبو کـە صـەفیە و دەسـتەیەك لـە ئافرەتانی موسڵمان لەگەڵ جەنگاوەرە موسڵمانەکان ڕۆیشتن بۆ جیهاد لەپێناو دینی خوادا ئاوی ئەهێنا ئەیدا بەتینوەکان و تـیری تیـژ ئـەکردو کـەوانی ئامـادە ئـەکرد، لەگـەڵ ئەمەشـدا ئامانجێکی تریشی هەبوو ئەویش ئەوە بو بەهـەموو هەسـت و نەستێکی چاودێری جەنگەکە بکات، لات سەیر نەبێت چونکە لەمەیدانی جەنگەکەدا کوڕی براکەی محمدی پێغەمبەری خوا (درودی خــوای لەســـەر بێــت) و براکـــەی حـــەمزەی کـــوڕی عبـدالمطلب شـێری خـواو کوڕەکـەی زوبـەیری کـوڕی عـەووام هـاوەڵی نزیکـی پێغەمبــەری خـوا (درودی ســەلامی خـوای لەسەر بێت) هەبوو .

هـەروەها لەشـەڕەکەدا لـەپێش هـەموو ئەمانـەو لەسـەرو هـەموو ئەمانـەوە چارەنوسـی ئیسلام بـو کـە بەویستی خـۆی گەردنی بۆ کەچ کردبوو، لەپێناویا کۆچ کردنی هەڵ بژاردبوو وە لەناویا ڕێگای بەهەشتی ئەبینی .

ئــەوە بــو ئــەو کاتــەی کــەبینی موســڵمانەکان دەوری پێغەمبەری خوایان(درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) چۆڵ کـردوە تـەنیا کـەمێکیان نـەبێت، وە زانـی کـە بتپەرسـتەکان لـەوەیابوون بگەنـە پێغەمبـەری خـوا (درودو سـەلامی خـوای لەسەر بێـت) و زیـانی پـیٚ بگەیـەنن، جەوەنـەی ئاوەکـەی فڕیٚ دایــە ســەرزەوی وەك شـێر چـۆن پـەلاماری نێچـیر ئـەدات پـەلاماری یـەکێك لەوانـەی دا کـە لەشـەڕەکە ڕایـان کـرد بـوو ڕمەکــەی لیٚ ســەند، ئەڕۆیشــت و ڕیزەکــەیانی ئــەبڕی و بەنوکەکەی پیای ئەکێشان ئەینەڕاند بەسەر موسڵمانەکانداو ئـەیوت: بـەڵاّ لێتانـدا ئـەوە لـە پێغەمبـەری خـوا ڕائەکـەن ؟!! کاتێك پێغەمبـەری خـوا درود و سـەلامی خـوای لێبێت بینـی کـەوادێت ترسـا حـەمزەی بـرای ببینێـت کـە لەسـەر زەوی کەوتووەو بتپەرستە کان لاشەکەیان زۆر ناشرین شێواندووە

ئامـــاژەی بـــۆ زوبێـــر کـــردو وتـــی : (ئـــەی زوبێـــر ئافرەتەکە...ئەی زوبێر ئافرەتەکە ...)

زوبێـر بـەرەو ڕوی چـوو وتـی: دایکـە دورکـەوە ...دایکـە دوورکەوە ...

صەفیە وتی : لاکەوە دایکت نییە .

زوبـەیر پێـی وت: پێغەمبـەری خـوا فـەرمانت پێئـەکات بگەڕێیتەوە

صـــەفیەوتی : بۆچـی ؟! ئـەوەم پێگەیشـتووە کەلاشـەی براکەم شێوێنراوە، ئەوە لەپێناوی خوابووە.

پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێـت) فـەرموی : (ئەی زوبەیر وازی لێبێنە بابڕوات ) زوبـەیر ڕێگـەی دا کاتێك شەڕتەواو بوو صەفیە لەسەر حەمزەی برای وەستابوو بینی کە سکی دڕاوە جەرگی دەرهێنـراوە ..لوتی بڕاوە گوێچکەی لێکراوەتـەوە ڕوخسـاری شـێوێنراوە داوای لـیٚ خـۆش بـونی بۆکرد و وتی:ئەمە لەپێناوی خودایە ...

ڕازیم بەفەرمانی خوا ...

سوێند بەخوا ئارام ئەگرم و وای دائەنێم کەلەپێناوی خوا دوچاری ئەمەبوم داوای پاداشت ئەکەم ئەگەر خوابیەوێت.

ئەمە هەڵوێستی صەفیەی کچی عبدالمطلب بوو ڕۆژی ئوحود بەڵام هەڵوێستی لەڕۆژی (خەندەق) چیرۆکێکی سەرنج ڕاکێشە کە بە بلیمەتی و زیرەکی ڕایەڵ کراوە وە بە ئازایەتی و بە جەرگی تەنراوە{سُداهاالدّهاءُ والذّکاءُ وَ وَلُعَمتُهاالبسالة والحزم}

بفەرموون لەگەڵ هەواڵەکەی کە کتێبە مێژوییەکان هەڵیان گرتووە.

لەڕەوشتی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) بوو کە نیازی غەزاکردنی ببوایە ژن ومندالی لەقەڵاکاندا دائەنا لەترسی ئەوەی نەبا لەکاتێك دا کەناتوانێت پارێزگاریان لێ بکات ناپاکێك بێتە ناومەدینە و تووشی بەڵایەکیان بکات ئەوەبو کەڕۆژی (خەندەق) خێزانەکانی و پوری واتە صەفیەی کچی عبد المطلب و دەستەیەك لەئافرەتانی موسوڵمانەکانی بردە قەڵایەك کەقەڵای حەسانی کوڕی ثابت بوو کەلەباپیرانیەوە بەمیرات بۆی مابوەوە

لەهـەموو قـەڵاكان بـەرگرتر و دورەدەسـت تربوو.ئـەو كاتـەی موســــوڵمانەكان لەچـــواردەوری خەندەقەكــــەبوون بــــۆ بەرەنگاربونــــەوەی قـــوڕەیش و هاوپەیمانــــەكانیان لــــەژن ومندالـەكان بـیٚ ئاگـابوون بـەهۆی ڕوبەڕوبونـەوەی دوژمنـەوە صەفیەی كچی عبدالمطلب زەلامێكی بینـی لەتاریكی بەرەبەیانـدا گوێی شلكرد و چاوی ووردكردەوە تابزانێت ئەوەیەهودییە بەرەو قەڵاكـە دێـت یـان نـا كەشـەبەنگی دا هەسـتیكرد كـە یەهودییـە و دڵنیابوو كە لەلایەن یەهودیەكانـەوە نێردراوە تـاكو بزانێـت لـەناو قەڵاكە پیاوی لیٚ یە تاپارێزگاری لەوانە بكات كەلە لەناوەوەن یان تەنها ژن ومنداڵی لیٚ یـە .لـەدڵی خۆیـدا ووتـی : جولەكـەی هـۆزی (قـورەیظـە) ئـەو پەیمانـەیان شـكاند كەلەگـەڵ پێغەمبـەری خـوا (درودی خــوای لەســـەر بێــت) بەســـتبویان هـــەروەها یارمـــەتی قـوڕەیش ئـەدەن و هاوپـەیمانیانن لـەدژی موسـوڵمانان لەبـەینی ئێمەو ئەواندا هیچ موسوڵمانێك نییـە هـەتا پارێزگاریمـان لێبكـات پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێـت) و ئەوانـەی لەگـەڵی دان لـە ڕوبەڕوبوونـەوەی دوژمنـدان ئەگـەر ئـەم دوژمنـی خوایـە بتوانێـت ڕاستیەكەمان بەرێتـەوە بـۆ هۆزەكـەی ئـەوا یەهودیـەكان

ژنەکان بەدیل ئەگرن و منداڵەکانیش ئەکەن بەبەندە کەئەمەش بۆ موسڵمانان نوشوستی یە.

ئەوجا پەلاماری پەچەکەی دا پێچای لەسەریەوە کراسەکەی هەڵکردوو لە ناوقەدیا توند بەستیو دارێکی درێژی خستە سەر شانی هاتە خوار بۆلای دەرگای قەڵاکە لەسەر خۆ و بەکارامەیی دەرگاکەی بەئاستەم کردەوە لەوێوە بەچاوکراوەیی وریاییەوە چاودێری دوژمنەکەی خوای ئەکرد هەتا کەدڵنیا بوو لەشوێنێکدایە ئەتوانێت لێی بدات بەهەموو هێزو توانای خۆی دارەکەی بەرز کردەوە کێشای بەسەریا تەختی کرد لەزەوی بەلێدانی دوەم و سێ یەم پشتگیری لێدانی یەکەمی کرد هەڵی کوتایە سەری تا هەناسەی لێ بڕی ...پاشان پەلاماری دا بەچەقۆیەك کەپێی بوو سەری بڕی و سەرەکەی لەقەڵاکەوە فڕێدایە خوارەوە سەری یەهودیەکە کەوتە گلۆر بونەوە بەخوێنەوە تا لەبندەستی ئەو یەهودیانەیا وەستایەوە کەلەخوارەوە چاودێری وچاوەڕوانیان ئەکرد . کاتێك یەهودیەکان سەری هاوڕێ کەیانیان بینی ووتیان : ئێمە ئەمانزانی کە محمد ژن و منداڵەکان بەبێ پاسەوان بەجێ ناهێڵێت ... پاشان

**گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان خوا لە لەصەفیەی کچی عبدالمطلب خۆش بێت . بەڕاستی نمونەیەکی تاکە بۆ ئافرەتی موسوڵمان .**

**تاقانەکەی پەروەردەکرد بەڕێك و پێکی پەروەردەی کرد کارەساتی براکەی توشهات جوانترین ئارامی لەسەرگرت ، لەتەنگانەشدا تاقی کرایەوە لەناویا ژنێکی بەتواناو ژیرو ئازا دەرچوو .....**

**پاشانیش مێژوو لەڕونترین لاپەڕەکانیا نوسیویەتی :**

**صەفیەی کچی عبدالمطلب یەکەمین ئافرەتە لەئیسلامدا بت پەرستی کوشتوە .**



# ڕیحانەکەی پێغەمبەر (ﷺ)

# فاطمەی زەهرا



## ﴿فاطمەی زەهرا﴾

ڕیحانەکەی پێغەمبەری خوا (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت)

((مەهدی لەنەوەی منە لە کوڕی فاطمە)) {محمد پێغەمبەری خوا (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت)} .

چیرۆکی ژیانی فاطمەی زەهرا بەشێکی پڕشنگدارە لەژیاننامەی پێغەمبەری مەزن (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت)، وێنەیەکی جوانە لەوێنەی ژیانی ماڵی پێغەمبەرایەتی بەڕێز .....

هەروەها نموونەیەکی جوان بوو بۆ هاوەڵە بەڕێزەکان کە لەسەری ئەڕۆیشتن لەکار و کردەوەکانیدا چاویان لێ ئەکرد.

فاطمە ی زەهرا ساڵی دروست کردنی کەعبە لەدایك بووە واتە پێنج ساڵ پێش ڕەوانە کردنی محمد بۆ گەیاندنی پەیامی پێغەمبەرایەتی .

دایکی فاطمە خانمێکی هێمن، ژیری و کارامەیی لەگەڵ خانەدانیەکی بەڕێزدا کۆکردبووە لەپاڵ ئەمانەشدا ڕەوشتی

جوان و سامانی فراوان، لەسەردەمی نەفامیدا بە داوێنپاك بانگ ئەكرا وە بەگەورەی ئافرەتانی قورەیش باس ئەكرا .

باوەڕی بەپێغەمبەری خوا كرد (درودو سەلامی خوای لەسەر بێت) كاتێك خەڵكی باوەڕیان پێ نەكرد .

بە ڕاستگۆی دانا كاتێك خەڵكی بەدرۆیان دانا بەسامانەكەی پشتیوانی كرد كاتێك خەڵكی بێ بەشیان كرد.

ئەم خانمە پڕشكۆیە كە وەكو گزنگی بەیان وابوو لەخوا نزیك بۆوە لەگەڵ نزیكبوونەوەی لەڕەوشت و ئاكاری بەرز و وەجاخێكی پاك و ماڵ و سامانێكی زۆری پڕ خێرو بەرەكەت. ئا ئەمە دایكی فاطمە ی زەهرایە بەڵام باوكی گەورەی نێردراوەكان و كۆتایی پێغەمبەرەكان و پێشەوای پارێزكارانە.

فاطمە گەورە بو بەم وەجاخە بەڕێزە كە وەجاخی بوو وە بەم باوكە گەورەیە كە باوكی بوو، فاطمە ی زەهرا دواین منداڵی باوكی بوو وە دوایین منداڵ بوو لەبن باڵی سۆز و بەزەییا ئەم دیوو ئەو دیوی ئەكرد .......

وە لەسایەی پێشوازی و خۆشەویستیا گاگۆڵکەی ئەکرد..........

بۆیە فاطمە ڕیحانەی پێغەمبەری خوا بوو درودی خوای لەسەر بێت چونکە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) بە ڕازی بوونی ئەو ڕازی ئەبوو، بە توڕەبوونی ئەو توڕە ئەبوو.

بەڵام سۆزی دایك و باوك جێی خۆی ناگرێت بەبێ گرتنە ئەستۆی پەروەردەکردنی ئەم خۆشەویستیە بەڕێزە و ئامادەکردنی بۆ هەڵگرتنی بەر پرسیارێتی .

ئەیگێڕنەوە کە بەدەستی خۆی خانوی بۆ خۆی دروست کردوە لە زۆربەی ڕۆژەکانیا کەس یارمەتی نەداوە، هەروەها لەڕۆژی (اُحد) برینی باوکی پێچاوە (درودی خوای لەسەر بێت).

کاتێك فاطمە تەمەنی گەیشتە تەمەنی پێ گەیشتنی ئافرەت ئەبو بەکرو عمر لەو کۆمەڵەیە بوون کە خوازبێنیان کرد ....

بـەلاّم پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێـت) زۆر بەڕێزەوە جوابی کردن وەك ئەوەی کە بیـەوێت بیـدات بە علـی ئامۆزای ڕەزای خوای لێ بێت .

لەسـالّی هەشـتەمی کۆچـیدا عـەلی کـوڕی ئـەبو طالـب خـوازبێنی فاطمـە ی زەهـرای کـرد لەبـەر ئـەوەی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێت) خێرا داواکەی قبولّ کرد عـەلی کڕنوشـی سوپاسـی بـۆ خـوا بـرد، کاتێـك سـەری لەکڕنوشـەکە بـەرز کـردەوە پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسەر بێت) پێی فەرموو: (خوای گەورە لێتـان پیرۆز بکـات و بەشی چاکتان پێ ببەخشێت کە لێی ڕازی بن و منـدالّی زۆرو باشتان لێ بکەوێتەوە).

لە مارەبڕینی فاطمە ی زەهرا عـەلی کوڕی ئـەبوطالـب و ابـو بکر و عمـر و عثمـان و طـەلحـەی کوڕی عوبەیـدالله و زوبیر لـە کۆچەران ئامادەبوون .

هەنـدێکیان نوێنـەری ژمارەیـەك لەئەنصـارەکان بـوون ، کاتێـك هـەموویان لەشوێنەکانی خۆیـان دانیشـتن پێغەمبـەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی : (سـوپاس بۆ ئـەو

خوایـــەی کەلەســـەر نیعمەتـــەکانی سوپاســـی ئـــەکرێت و بەندایەتی بۆ ئەکرێت خوای گەورەو باڵادەست هاوسەرگیری کـــردووە بەمایـــەی وەچەخســـتنەوە فـــەرمانێکی واجـــب و حـــوکمێکی عادلـــە و خێرێکـــی گشـــتگیرە و پەیوەندییـــە خزمایەتیەکانی تیادا بەردەوام و توندو تۆڵ ئەبێت، خوای گـــەورە ئەفـــەرموێت: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ مِنَ ٱلْمَآءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُۥ نَسَبًا وَصِهْرًا ۗ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴿٥٤﴾ ﴾ الفرقان: ٥٤

(هـەر ئـەو زاتەیـە کـە لـەئاو ئـادەمیزاد دروسـت دەکـات و کردویـەتی بـەهۆی خزمایـەتی بێگومـان پـەروەردگاری تـۆ بەردەوام دەسەڵاتی بێ سنورە).

ئێوە ئاگادار بن کەمن فاطمە لەعەلی مارە ئەکەم لەسەر چوار سەد مسقاڵ زیوو ئەگەر ڕازی بێت لەسەر سوننەتی دامەزراو و فەرمانی پێویست .

خوای گەورە پێکەوە کۆیان بکاتەوەو لێیان پیرۆز بکات و وەجاخیان ڕوون بکات .

ئـەوە ئـەو قسـانە بـوو كـە پـێم وتـن و داوای لێخۆشـبون لەخوای پەروەردگار ئەكەم)

گـەورەی ئافرەتـانی موسـڵمان كـرا بـەبووك چـوە مـاڵی هاوسەرەكەی، هیچ شتێكی نەبوو جگە لەدۆشەكێك كە مەرج بوو لەگەڵ سەرینێكی چەرم ناوەكەی پووشـی خورمـا بـوو وە تەشـتێك كەلەچـەرم دروسـت كرابـوو وە جەوەندەیـەك و بێژنگێك و جامێك و دەستاڕو دوو گۆزە .

پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێـت) نـەی تـوانی لەسـەر دووری زەهـرا ئـارام بگرێـت ویسـتی كـە بیكـات بەدراوسـێ ی خـۆی لـەنزیكی خـۆی خـانوی (حارثـەی كـوڕی نعمـان) هـەبوو هـات بـۆ لای پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێت) وتـی: پێم گەیشـتوە ئەتـەوێت فاطمـە بهێنیتـە نزیـك خـۆت ئـەوە خـانوی منـە و نـزیكترین خـانووی بـەنی نەجارە لەتۆ وەمن و ماڵەكەم بۆ خـواو پێغەمبـەری خـواین وە سـوێند بـەخوا ئـەی پێغەمبـەری خـوا: ئـەو ماڵـەی كەلـەمنی وەرئەگریت خۆشەویسترە لام لەوەی كە وەری ناگریت .

پێغەمبــــەری خــــوا (درودی خــــوای لەســــەر بێــــت) فەرمووی:(ڕاستت کرد بەرەکەتی خوا لەسەرت بێت).

پاشــــان فاطمــــە هاتــــە دراوســــێ ی و لەخانویــــەك لەخانوەکانیحارثە (ڕەزای خوای لێ بێ) نیشتەجێ بوو.

لەو کاتەی زەهرا لەنزیکی باوکی نیشتەجێ بوو هەموو بەیانیەك پێغەمبەری خوا ئەچوو بۆ دیدەنی فاطمە ی زەهرا، کە بانگی بەیانی ئەدرا بەدەستەکانی لەدەرگای ماڵەکەیانی ئەداو ئەیفەرموو : (سڵاوی خواتان لێ بێت خاوەن ماڵ خوا پاکتان بکاتەوە بەپاککردنەوە) .

هەروەها پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) ئەگەر لەسەفەر بگەڕایەوە سەرەتا ئەچوە مزگەوت دووڕکات نوێــــژی ئــــەکرد دواتــــر ئەچــــوە مــــاڵی فاطمــــە درێــــژەی بەدانیشتنەکەی ئەیا پاشان ئەهات بۆ ماڵی خێزانەکانی .

لە (محمدی کوڕی قەیس)ەوە ڕیوایەت کراوە جارێکیان پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) ڕۆیشت بۆ سەفەرێك علی کوڕی ابوطالیبی لەگەڵدا بوو، لەکاتی نەبونی ئەواندا فاطمە دوو بازنگ و ملوانکەیەك و جوتێ گوارەی

دروستكرد و پەردەیەكی بەدەرگاكەوە هەڵواسی بۆ پێشوازی كردن لەباوكی و مێردەكەی ، كاتێك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) هاتەوە چوو بۆ لای فاطمە هاوەڵەكانی لەدەرەوە ڕاوەستان ئەوەندە لەلای مایەوە نەیان ئەزانی چاوەڕێ ی كەن یان بڕۆن، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) هاتە دەرەوە زانیان كەلەدەم و چاویا تووڕەیی هەیە هەتا چووە سەر مینبەر .

ئەو كات فاطمە ڕەزای خوای لێ بێ هەستی كرد كە بەهۆی بینینی بازنگ و ملوانكە و گوارە و پەردەكانە، گوارە و ملوانكە و بازنگەكانی داكەند و پەردەكەی لێ كردەوە و ناردی بۆ لای پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) ووتی بەو كەسەی كەشتەكانی پیادا نارد بۆ لای باوكی بڵێ : بە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێت) كچەكەت سەلامت لێ ئەكات و ئەڵێت ئەمانە لەپێناو خوادا ببەخشێت.

كاتێك كە بۆیان هێنا فەرمووی: ئیشەچاكەكەی كرد ـ باوكی بە فیدای بێت ـ دنیا نەبۆ محمدە و نەبۆ خێزانی محمد

ئەگەر دنیا بەقەد باڵەمێشوولەیەك لای خوا خێری هەبوایە بێ باوەڕ قومێك ئاوی لێ نەئەخواردەوە .

پاشان زۆری نەبرد ماڵی فاطمەی زەهرا بەنەوەی چاك خۆشی تێ کەوت ....

خوای گەورە حسن وحسین و محسین و زەینەب وأُم کلثوم ی بەم دایك و باوکە بەڕێزە بەخشی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) زۆردڵی پێیان خۆش بوو ئەگێڕنەوە کاتێك حەسەن لەدایك بوو باوکی ناوی نا (حەربا ) پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) هات فەرموو : (کوڕکەمم نیشان بدەن ، ناوتان ناوەچی ؟)

وەوتیان :حەربا

فەرموی :(بەڵام ئەو حەسەنە )

پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) منداڵەکانی فاطمە ی ئەلاواند و ژیری ئەکردن و گاڵتەی لەگەڵ ئەکردن و هەڵی ئەپەڕاندن، وە ئەڵێن کەیەکێکیان ئەچوە سەرشانی کاتێك کەنوێژی ئەکرد نوێژەکەی هێواش ئەکردو سوجدەکەی درێژئەکردەوە بۆ ئەوەی نەکەوێتە خوارەوە.

هـەروەها لەدەسـتوری پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسەر بێت) وابو جاروبار لەماڵی فاطیمە ئەمایەوە خزمەتی منداڵەکانی ئەکرد لەکاتێك دا دایك وباوکیان دانیشتبون .

لەشـەوێك لەوشـەوانە دا گـوێی لەحەسـەن بـوو داوای ئـاوی ئەکرد، پێغەمبەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێت) هەسـتا چـوەلای جەوەنەکـە و پـەرداخێك ئـاوی تێکـرد حسـەین پـەلاماری دەسـتی دا ئـاو بخواتـەوە، بـەڵام پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێـت) ئاوەکـەی لـەو دورخسـتەوە و لەپێشدا دای بە حەسـەن فاطمـە ورتـی: ئـەڵێی ئـەوت خۆشتر ئەوێت ؟

پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێـت) فـەرمووی : ئەو یەکەم جار داوای ئاوی کرد .

فاطمـە ڕەزای خـوای لـێ بێـت ئەگـەر بچوایە بۆلای باوکی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) دەستی ئەگرت و بـەخێرهاتنی ئـەکردو لەمەجلیسـی خۆیـا دای ئەنیشـان ...

هەروەها ئـەڵێن کاتێك فاطیمـە ئـەهات پێغەمبـەری خـوا (د.خ) لـە بـەریا هـەڵ ئەسـتا بـەخێر هـاتنی ئـەکرد و تـەوقـەی لەگـەڵ

ئەکرد فاطمە چوەلای  پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) کەلەنەخۆشی سەرەمەرگ دا بوو پێغەمبەری خوا بانگی کرد قسەیەکی بەگوێدا چرپاند ... فاطمەدەستی کرد بەگریان ... پاشان بانگی کرد قسەیەکی تری بەگوێدا چپاند پێکەنی، عائیشە چاوی لەمەبوو لەدڵی خۆیدا وتی: من وائەزانم ئەم ئافرەتە واتە (فاطمە)ی تایبەت کرد لەنێو ئێمەدا بۆیە پێشتر ئەگریاو دوایی پێکەنی .

کاتێك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) کۆچی دوایی کرد عائیشە ڕەزای خوای لێ بێت دەربارەی ئەوە لەفاطمەی پرسی لەوەلامدا وتی:

یەکەمجار چپاندی بەگوێمدا پیێ ی وتم کە ئەمرێت بۆ ئەوە گریام .

دووەم جار پیێ ی وتم کەمن یەکەم کەسم لەخێزانەکەی کە بەدیداری ئەگەمەوە بۆ ئەوە پێکەنیم.................

فاطمە زۆر نەمایەوە لەدوای باوکی (درودی خوای لەسەر بێت) دوای چەند مانگێکی کەم گەیشتە لای باوکی هەندێك

ئـەڵێن شـەش مـانگ و هەنـدێك ئـەڵێن سـێ مـانگ و هەنـدێك ئەڵێن دوو مانگ بەپێی ڕیوایەتەکان جیاوازی هەیە .

لەڕەمــەزانی ســاڵی یانزەیــەمی کۆچــی فاطمــەی زەهــرا هەستی کرد لەلایەن خوای گەورەوە بانگ کراوە زۆر دڵخۆش بوو بەوەی کە بەدیداری باوکی شاد ئەبێت.

کاتێك فاطمە کاتی کۆچکردنی هات بەدەستەکانی خـۆی خـۆی شـت وە بەهاوڕێکـەی کـە أسمـاءی کچـی عومـەیس بـوو وت دوای ئەوەی کە خۆشتنێك خۆی ی شت باشتر لەهەموو جارێك: ئەی کەنیزەك جل و بەرگە تازەکانم بۆ بهێنـە، لەبـەری کردو پاشان ووتی: خۆم شت باکەس بۆ کفنکردنم نەم بینێت ئنجـا پێکــەنی، کــە لــەدوای مردنــی بــاوکی نــەیان بینیبــو پێبکەنێت ئەو کاتە نەبێت کە گیانی دەرچوو.

خــوای گــەورە ســۆز و بــەزەیی فراوانــی بڕژێنێــت بەســەر ڕیحانەی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) .

کـرا بـەبووك بۆ عـەلی لـە ڕەمـەزان هـەروەها کـرا بـەبووك بـۆ بەهەشت لەڕەمەزان .

## ﴿ئەسمائی کچی ئەبوبەکر﴾

### خاوەنی دوو پشتێن

((تەمەنی ئەسماء سەد ساڵ بوو نەیەك دان و نەیەك خرێی نەکەوتبوو، وە هیچ شتێکیشی لەبیر نەچوبۆوە))
{مێژوو نوسان}

ئەم هاوەڵەمان لەهەموو لایەکیەوە خانەدانیەتی کۆکردبوەوە...

باوکی هاوەڵی پێغەمبەری خوابوو (درودی خوای لەسەر بێت) باپیری هاوەڵ بوو، خوشکی هاوەڵ بوو، هاوسەرەکەی هاوەڵ بوو، کوڕەکەی هاوەڵ بوو ...

ئەمەی بەس بوو بۆ ڕێز و شانازی.

باوکی هاوڕێی خۆشەویستی پێغەمبەری خوا بوو (درودی خوای لەسەر بێت) لەژیانیداو، جێنشینی بوو لەدوای مردنی ... وەباپیری أبوعەتیق باوکی ئەبوو بەکر بوو...

خوشــــكەكەی دایكـــی ئیمانــــداران عائیشـــەی پـــاكی سەرفرازبوو هاوسەرەكەشی هاوەڵی نزیكی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) زوبێری كوڕی عەووام بوو.

وە كوڕەكەشـی عبـدالله ی كـوڕی زوبـەیر بـوو خـوای گـەورە لەهەمویان ڕازی بێت.

ئەمە بەكورتی ئەسمائی كچی ئەبوبەكری صدیق بوو.

ئـەسماء لەموسـڵمانە پێشـەنگەكانە و لـەم بەخشیشـە گەورەیـەدا تـەنها حەڤدەكـەس لـەژن و پیـاو پێشـی كـەوتبوون نازنـاوی خـاوەنی دوو پشـتێنەكەی لـیّ نـرا لەبـەر ئـەوەی لـەڕۆژی كۆچـكردنی پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێـت) لەگـەڵ بـاوكی دا بۆمەدینـە خـواردن و ئـاوی بـۆ ئـەبردن هیچی دەست نەكەوت پێـی ببەستێت بۆیە پشتێنەكەی كرد بـــەدو كەرتـــەوە بەلـــەتێكیان توێشـــە بەرەكـــەی بەســـت و بەلەتەكـەی تـر جەوەنـدەی ئاوەكـە پێغەمبـەری خـوا (درودی خوای لەسەر بێت) دوعای بۆكرد كەخوای گەورە لەبری ئەوە لەبەهەشـتا دووپشـتێنی پێببەخشـێت لەبـەر ئەمـە نـاونرا خاوەنی دووپشتێن.

زوبەیر کوڕی عەووام خواستی کەگەنجێکی هەژار بوو خزمەتکاری نەبوو خزمەتی بکات، پارەیەکی نەبوو خەرجی خێزانەکەی پێ دابین بکات تەنها ئەسپێك نەبێت کەبژێوی ژیانیانی پێ پەیدائەکرد .

بەڵام خوای گەورە ژنێکی چاکی پێ بەخشی بوو، خزمەتی ئەکرد ئەسپەکەی بۆ ئەلەوەڕاند ئەی بەستەوە، ناوکی خورمای ئەهاڕی ئەیکرد بە عەلەف بۆ ئەسپەکەی هەتا خوای گەورە دەرگای لێ کردەوەو بۆ بەدەوڵەمەندترینی هاوەڵە دەوڵەمەندەکان .

کاتێك هەلی بۆ ڕەخسا کەبەدینەکەیەوە کۆچ بکات بۆ مەدینە بۆلای خواو پێغەمبەری خوا سکی نۆمانگ بوو بەکوڕەکەی کە (عبدالله ی کوڕی زوبەیر )ە بەلاّم ئەمە ڕێگرنەبوو لەبەرەنگار بونەوەی ناڕەحەتیەکانی ئەوگەشتە دورودرێژە. کاتێك گەیشتنە (قُباء )منداڵەکەی بوو ... موسڵمانەکان دەستیان کرد بە الله اكبر کردن چونکە ئەمە یەکەم منداڵی کۆچەرەکان بوو لەمەدینە لەدایك ببێت . هەڵیان گرت بۆلای پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر

بێــت) خســتیە باوەشــیەوە هەنــدێك لــەلیكی خــۆی كــردە ناودەمی منداڵەكەوە و دوعای بۆكرد یەكەم شتێك كە چوە ناو سكیەوە لیكی پێغەمبەری خوابوو (درودی خوای لەسەر بێت)، لە ئەسمائی كچی ئەبوبەكر دا هەمو لایەنەكانی چاكە و جــــوامێریی و خانەدانییـــــەكی گشـــــگیر و بیرمەنـــــدیی كۆبوبونـــەوە كـــە لەهەنـــدێك پیـــاوی زۆردەگمەنـــدا نـــەبێت كۆنابنەوە .

لەبەخشندەیدا ئەوەندە بەخشندە بوو كە بەنمونە باس ئەكرا عبداللە ی كوڕی عەبباس ئەكات و ئەفەرموێت : دوو ئافرەتم نەبینیوە وەك پورم عایشەودایكم بەخشندە بن بەڵام بەخشندەییەكەیان جیاواز بوو پورم شتی كۆ ئەكردەوە هەتا زۆر ئەبوو ئینجا بەسەر هەژاراندا دابەشی ئەكرد بەڵام دایكم هیچ شتێكی تاڕۆژی دوایی لای خۆی هەڵ نەئەگرت.

ئەسماء ئەوەندە ژیر بوو كەئەیتوانی لەكاتی هەڵوێستە ناچاریەكاندا زۆر بەچاكی هە ڵسوكەوت بكات ... یەكێك لەو هەڵوێستانە ئەوەبوو كاتێك ئەبو بەكری صدیق بەهاوڕێیەتی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) كۆچی كرد بۆمەدینە

هەموو پارەکانی لەگەڵ خۆیدا برد کەبڕەکەی شەش هەزار درهەم بوو، هیچ شتێکی بۆ خێزانەکەی بەجێ نەهێشت کاتێك ئەبوقوحافەی باوکی بەکۆچ کردنەکەی زانی کەئەوکاتە بێ باوەڕبوو هات بۆماڵیان و بەئەسمائی ووت : سوێند بەخوا من وا ئەبینم کەلەپارەکانی بێبەشی کردون وەك چۆن لەخۆی بێبەشی کردون ...

ئەسماء ووتی : نەخێر باپیرە ئەو پارەی زۆری بۆ بەجێهێشتوین پاشان چوو هەندێ چەوری هێنا خستیە ناو تاقێکەوە کەلەدیوارەکەدا بوو پارەیان تیا دائەنا جلێکی بەسەرادا ئینجا دەستی باپیری گرت چونکە باپیری چاوی کوێربوو پێی ووت: باپیرە سەیرکە چەندی پارە بۆ بەجێ هێشتوین باپیری دەستی خستە سەرو ووتی : قەیناکە ... ئەگەر ئەم هەموو پارەیەی بۆ بەجێ هێشتبێ شتێکی باشە، ئەسماء ویستی بەم کارەی باپیری پیری دڵنیا بکات ونەبا باپیری لەپارەی خۆی بیان داتێ ئەوەش لەبەرئەوەی نەی ئەویست بێباوەڕێك هەتا ئەگەر باپیریشی بێت یارمەتیان بدات و منەتیان بەسەردابکات، ئەگەر مێژوو هەموو ئەم

هەڵوێستانەی ئەسمائی کچی ئەبوبەکر لەبیر بکات، هەرگیز بیرتیژ یەکەی و خۆڕاگریە توندەکەی و هێزی باوەڕەکەی لەبیر ناکات ئەوکاتەی کە دوا دیداری لەگەڵ عبدالله ی کوڕی کرد .

ئەوەبوو کوڕکەی کەعبدالله ی کوڕی زوبەیر بوو لەدوای مردنی یەزیدی کوڕی معاوییە بووبە خەلیفە کە فەرمانڕەواییەکەی حیجاز و میسر و عێراق وخۆراسان و زۆربەی وڵاتی شامی گرتبۆوە بەڵام هۆزی (ئومەییە ) زۆری نەخایاند سوپایەکی چڕوپڕیان بۆ شەڕکردن بەسەرۆکایەتی (حەجاجی کوڕی یوسفی ثەقەفی ) ناردەسەر، شەڕێکی قورس لەنێوان هەردو سوپاکەدا ڕویدا کوڕی زوبەیر وەك سەربازێکی پاڵەوان کەنازناوی پاڵەوانە ئازاکە شایەنی سوارێکی وەك ئەوبوو لەم شەڕەدا دەرئەکەوت بەڵام لایەنگرەکانی وورده وورده لەدەوری کەم ئەبونەوە عبدالله ی کوڕی زوبەیر و ئەوانەی لەگەڵی دابوون هاتن بۆماڵی خوا بۆ ژێر سایەی کەعبەی پیرۆز پێش کوژرانی بەچەند سەعاتێك چوەلای دایکی ئەسماء ی کچی ئەبوبەکر کەپیرەژنێکی

یەککەوتە بوو چاوەکانی کوێر بوو بوو عبداللە وتی: سڵاو و ڕەحمەت و بەرەکەتی خوات لێ بێت ئەی دایە

ئەسماء وتی: سڵاو لەتۆش ئەی عبداللە ...

چ شتێك لەم کاتەدا تۆی هێناوە بۆئێرە بەردی مەنجەنیقەکانی حەجاج کەلەسەربازەکانتی ئەگرێت لە حەرەم دەورو بەری مەککە ئەلەرزێنێت؟

عبداللە وتی : هاتوم تاك و ڕاوێژت پێبکەم.

ئەسماء وتی : لەبارەی چیەوە ڕاوێژم پێ ئەکەیت ؟!

عبدالله وتی : خەڵکی بەجێم ئەهێڵن و وازم لێ ئەهێنن و ئەڕۆن بۆلای حەججاج یان لەترسان یان لەبەرئەوەی لای حەججاج دەستیان ئەکەوێت تەنانەت منداڵەکانم و قەومەکەشم لێم جیا ئەبنەوە، هیچ کەس لەگەڵمانیە جگە لە ژمارەیەکی کەم لەپیاوەکانم، ئەوانیش هەرچەندە خۆڕاگر و بەئارام بن بەرگەی سەعاتێك یان دوو سەعات ئەگرن هەروەها هۆزی (ئومەییە ) نێردراویان ناردووە بۆلام تا گفتوگۆم لەگەڵدا بکەن بۆ ئەوەی چەك دابنێم و پەیمان بە عبدالمەلیکی

کوڕی مەڕوان بدەم ببێتە خەلیفە لەبەرامبەردا چیم بوێت لەدنیا پێم ئەدەن تۆ ئەڵێی چی ؟

ئەسماء دەنگی بەرز کردەوە ووتی :

ئەی عبدالله کێشە کێشەی خۆتە، تۆ باشتر لەناخی خۆت شارەزای ئەگەر وائەزانیت کەتۆ لەسەر حەقیت، وە بانگەشەی حەق ئەکەیت ئارام بگرەو زۆرانبازی بکە وەك چۆن هاوەڵەکانت ئارامیان گرت تالەژێر ئاڵاکەتدا شەهیدبوون وە ئەگەر دنیاشت ئەوێت ئەوا تۆ خراپترین بەندەیت ... خۆت لە ناو ئەبەیت و پیاوەکانت لەناو ئەبەیت عبدالله ووتی: بەڵام ئەوە گومانی تیانیە کە ئەمڕۆ من ئەکوژرێم ئەسماء ووتی : ئەوەبۆ تۆ باشترە لەوەی خۆت تەسلیمی حەججاج بکەیت بەدەستی خۆت، منداڵانی هۆزی ئومەییە یاری بە کەللە سەرەکەت بکەن.

عبدالله ووتی : لەمردن ناترسم بەڵام ئەترسم لاشەکەم بشێوێنن .

ئەسماء ووتی : لەدوای مردن شتێك نی یە کەخەڵکی لێی بترسێت گورونی پێستە ئازار بەمەڕی سەر بڕاو ناگەیەنێت

عبدالله ناوچاوانی گرژی ڕوناك بۆوه و ووتی : پیرۆز بێت لەم دایکە، پیرۆز بێت پلەو پایەی بەڕێزت منیش بۆهیچ شتێك نەهاتم لەم کاتەدا بۆ ئەوەنەبێت گوێم لەوەبێت کەگوێم لێ بوو، وەخوا ئەزانێت کەمن بێ هێز و لاواز نەبوم ، وەئەو ئاگادارە کەمن ئەوەی کە ئەیکەم لەبەر خۆشەویستی دنیاو جوانیەکانی نیە بەڵکو لەترسی توڕەبونی خوایە لەوەی کە حەرامەکانی حەڵاڵ بکەم ...

هەر ئێستا ئەڕۆمەوە بۆئەوەی کە هەردوکمان پێمان خۆشە، بەڵام ئەگەر من کوژرام بۆم دڵگران مەبەو هەمووشتێکت بەخوای گەورەبسپێرە ...

ئەسماء ووتی : ئەگەر لەڕێی ناڕەوادا بکوژرێیت خەفەت ئەخۆم .

عبدالله ووتی : تۆ دڵنیای لەوەی کەکوڕەکەت هیچ کات لەسەر خراپە نەڕۆیشتوە و هەرگیز کاری ناشرینی نەکردووە و فەرمانی خوای نەشکاندووە، هەروەها خیانەتی لە ئەسپاردە نەکردوە و ستەمی لەموسڵمان و لەوکەسانە نەکردوەکە لەژێر فەرمانڕەواییدا بوون وە هیچ شتێك لەلای

ئەو باشتر نەبووە لە ڕازیبوونی خوای پەروەردگار ... ئەمە بۆ ئەوە ناڵێم کەباسی خۆم بکەم، وە خوا لەخۆم باشتر من ئەناسێت، تەنها بۆ ئەوە ئەمانەم ووت کەدڵت ئارام بێت ئەسماء ووتی : سوپاس بۆخوا لەسەر ئەوەیت کەخواپێ ی خۆشەو منیش پێم خۆشە.

ئینجاووتی : کوڕم لێم نزیك بەرەوە تاك و تێربۆنت بکەم و دەست بەلەشتا بێنم چونکە لەوانەیە ئەمەدواین دیدارمان بێت. عبدالله کەوت بەسەر دەست و پێ ی دایکیا ماچی ئەکرد ئەسمائیش لوتی ئەهێنا بەسەر و گەردنیا بۆنی ئەکرد و ماچی ئەکرد دەستی برد بیهێنی بەلەشیا دەستی گێڕایەوە و ووتی : ئەی عبدالله ئەمە چیەلەبەرتا ؟!

عبدالله ووتی: ئەوەقەڵغانەکەمە، ئەسماء ووتی : ئەوەچی یە کوڕم ئایا جلی کەسێکە کەشەهیدبونی ئەوێت ؟!

عبدالله ووتی : بەڵام بۆ ئەوەلەبەرم کردووە باشتر بم لەگەڵ تۆو دڵت ئارام بکەم.

ئەسماء ووتی : لەخۆتی بکەرەوە، بەم جۆرە باشتر پارێزگاری لەخۆت ئەکەیت و ئازاترئەبیت وە بەهێز و

دامەزراوتر ئەبیت، چونکە ئەوجلە جولەت هێواش ئەکاتەوە بەڵام لەبری ئەوە پانتۆڵێکی زیادە لەپێ بکە بۆئەوەی ئەگەر کوژرایت عەورەتت دەرنەکەوێت .

عبدالله ی کوڕی زوبەیر قەڵغانەکەی داکەند پانتۆڵەکەی توند کردو و ڕۆیشت بۆ حەرەم بۆدرێژەدان بەشەڕ و ئەیووت: ئەی دایکە بێبەشم مەکە لەدوعا ئەسماء دەستەکانی بۆئاسمان بەرزکردەوە و فەرمووی : خوایە ڕەحم بەمانەوەی لەشەو نوێژ و گریانی بەکوڵی بکە لەتاریکی شەودا کاتێك خەڵکی لەخەودان خوایە ڕەحم بەتینوێتی وبرسێتی کاتی کۆچکردنی بەینی مەککە و مەدینەی بکە کاتێك کە بەڕۆژووە خوایە ڕەحم بە چاکەکردنی لەگەڵ دایك و باوکی بکە خوایە گیان من سپاردم بە تۆ ڕازیم بەوەی تۆ بۆت داناوە وە پاداشتی ئارامگران لەسەری بەمن ببەخشە، خۆری ئەوڕۆژە ئاوا نەبوو کەعبدالله ی کوڕی زوبەیر بەخزمەتی خوای پەروەردگار گەیشتەوە تەنها چەند ڕۆژێکیش دوای ئەو کەلە دە ڕۆژ زیاتر و لەبیست ڕۆژ کەمتر بوو ئەسمائی کچی ئەبوبەکریش ڕۆیشتەوە بۆ خزمەتی خوای پەروەردگار،

تەمەنی گەیشتبوە سەد ساڵ نەدانێك و نەخرێیەكی نەكەوت بوو هیچ شتێكیشی لەبیر نەچوبوەوە.

## ﴿نوسەییەی مازنی﴾

((لەرۆژی ئوحد ڕوم وەرنەگێڕاوە بەلای ڕاست و چەپدا کە نەم بینیبێت (اُم عُمارَة)ە لەبەر من شەڕ ئەکات) {محمد پێغەمبەری خوا}

((ئێوە دیدارێکتان لەگەڵ پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) هەیە لە عەقەبە لەکۆتایی بەشی یەکەمی شەودا)).

ئەمە ئەو قسەیە بوو کە موسعەبی کوڕی عومەیر بەگوێی یەکێك لەموسڵمانەکان لەشاری (یەثریب)دا چرپاند هەواڵەکە وەك بای شەماڵ لەخێراییدا و لەنهێنیدا و لەسەرخۆییدا بەنهێنی گەیشت بەو موسڵمانانەی بەدزیەوە لەناو ڕیزی حاجیە بتپەرستەکاندا بوون کە بەرەو مەککە ئەهاتن و لەهەموو لایەکەوە لەبت پەرستەکانیان شاردەوە .

کاتێك شەو داهات حاجیە موشریکەکان هەر زوو خەویان ئەهات چونکە زۆر هیلاك بوو بەهۆی ئەو هەموو سوڕانەوەیە بەدەوری بتەکاندا و قوربانیکردن بۆیان بەلام هاوەڵەکانی

موصـعەبی کـوڕی عومـەیر لەموسـڵمانانی (یـەثریـب) چـاویـان لێکنەنا.

جا چۆن چاو لێکبنێن؟!

کاتێـک دڵیـان پەلەپەلیـەتی بـۆ بینینـی ئـەو کەسـەی لەپێناویـدا بیابـانی فـراوان و زەوی ڕوتـەنیان بڕیـوە دڵیـان خەریکە لەبەینی پەراسوەکانیانەوە ئەفڕێت لەخۆشی بینینـی پێغەمبەرەکەیان (درودی خوای لەسەر بێت) .

زۆربـەیان باوەڕیـان پـێ هێنـابوو پـێش ئـەوەی بەدیـداری شـادبن وە هـۆگری ببـون پـێش ئـەوەی چـاویان بـەبینینی بڕێژن..........

لـەکۆتای بەشـی یەکـەم لـە دوەم شـەوی ئـەو سـێ شـەوەی کـەپێی دەوترێـت (ایـام التشـریق) لـە عەقەبـە لەشـوێنێك کـە پێـی دەوترێـت (مینـا) ئـەم دیـدارە گەورەیـە دور لەدەسـتی قورەیش ڕووی دا .

لـــەم دیـــدارەدا حـــەفتا و دوو پیـــاو چونەپێشـــەوە لەپێغەمبەری خواو دەستیان خستە ناو دەستی و پەیمانیان

لەسەر ئەوە پێدا کە پارێزگاری لێبکەن وەك چۆن پارێزگاری لەماڵ و منداڵی خۆیان دەکەن .

کاتێك پیاوەکان تەواو بوون دوو ئافرەتیش هاتنە پێشەوە کەپەیمان بدەن لەسەر ئەوەی کە پیاوەکان پەیمانیان پێدا بەلاّم بەبێ تەوقەکردن چونکە پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر بێت) تەوقەی لەگەڵ ئافرەتاندا نەدەکرد .

یەکێك لەو دوو ژنە ناسرابوو بە (اُم منیع)[٢]

ئەوی تریان نوسەیبەی کچی کەعبی مازنی ناسراو بە( اُم عمارە) بوو .

ئوم عمارە گەڕایەوە بۆ (یەثریب) زۆر دڵی خۆش بوو بەو بەخششەی کەخوای گەورە بەدیداری پێغەمبەری خۆشەویستی شاد کردبوو (درودی خوای لەسەر بێت) پابەند بوو بەو بەڵێنەوە کە بە پێغەمبەری خوای دابوو(درودی خوای لەسەر بێت) .

---

أم منیع، أسماء کچی عمرە دایکی هاوەڵی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێت) مُعازی کوڕی جەبل .

پاشان ڕۆژگار بەخێرایی تێپەڕین، تا ڕۆژی (ئوحد) هاتە پێشەوە لەو ڕۆژەدا ئوم عومارە گرنگیەکی هەبوو بەڵام چ گرنگیەك ؟!

ئوم عومارە ڕۆیشت بۆ ئوحود لەگەڵ خۆیدا جەوەنەیەك ئاوی هەڵگرتبوو تا تونیەتی ئەو تێکۆشەرانەی پێ بشکێنێت کە لەپێناو دینی خوادا شەڕیان دەکرد، لەفافەکانیشی لەگەڵ خۆیدا بردبوو تاکو برینەکانیان بپێچێت.

شتێکی سەرسوڕهێنەر نیە لەجەنگەکەدا هاوسەرەکەی و سێ دڵی لەگەڵ بوو کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) وە هەردوو کوڕەکەی حەبیب و عبداللە بوون .

ئەمە جگە لەخوشك و برا موسڵمانەکانی کە پارێزگاریان لە دینی خوا و لەو بەڵێنە ئەکرد کەبەپێغەمبەری خوایان دابوو(درودی خوای لەسەر بێت) .

ئینجا ڕۆژی ئوحود چ ڕۆژێك بوو ............!

لەو ڕۆژەدا ئوم عومارە بەچاوی خۆی بینی چۆن سەرکەوتنی موسڵمانەکان گۆڕا بۆ شکانێکی گەورە ...

وه چۆن لـه ڕیـزی موسـڵمانەکان خـەڵك ئـەکوژرێت و شـەهید لەدوای شەهید ئەکەونە سەر زەوی ...

وه چـۆن قاچـەکان ئەلـەرزن و پیاوەکـان پێغەمبـەری خـوا (درودی خوای لەسـەر بێـت) بـەجێ دەهـێڵن هـەتا هـیچ کەسـی بـەدەورەوە نـەمابوو تـەنها ژمارەیـەکی زۆر کـەم نـەبێت کـە دە پیاو بون یان نزیکەی دە پیاو بوون .

ئــەوە بــوو یــەکێك لــەبێباوەڕەکان هــاواری کــرد : محمــد کوژراوە.... محمد کوژراوە .

لەو کاتەدا ئوم عومارە جەوەنەکەی فڕێ دا هاواری کردو وەك پڵنگ کە بۆ نێچیر ڕا بکات ڕۆیشت بۆ ناو جەنگەکە .

بـا ئەمـە جـێ بهـێڵین بـو ئـوم عومـارە تـا بـۆ خـۆی بۆمـان بگێڕێتەوە چونکە هیچ کەس ناتوانێت وەك ئەو وێنـەی سـاتە یەکلاییکەرەوەکان بەوردی و ڕاستی نیشان بدات ئوم عومارە ئەڵێت:

لەبەیانی ئەو ڕۆژەدا ڕۆیشتم بۆ ئوحود جەوەندەیەکم پێ بـوو تێکۆشــەرەکان ئاویــان لێ خــواردەوە هــەتا تــەواو بــوو لــە

سەرەتادا سەرکەوتن و هێزو دەسەلآت بۆ پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێت) و ئەوانە بوو کە لەگەڵیدا بوون .

زۆری نەبرد موسڵمانەکان دەوری پێغەمبەری خوایان چۆڵ کرد هیچ کەس نەما چەند کەسێك نەبێت کە ژمارەیان لە دە کەس زیاتر نەئەبوو .

من و کوڕەکەم و هاوسەرەکەم چووین بۆ لای وەك بازنگە چون دەوری مەچەك ئەیا ئاوا دەورمان دا بەهەرچی هێز و ئەو چەکەی پێمان بوو پارێزگاریمان لێ ئەکرد پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) ئەیبینی من قەڵغانم پێ نییە بەرگری لەخۆم بکەم کە موشریکەکان لێ یان ئەدام پیاوێکی بینی ڕای ئەکرد قەڵغانی پێ بوو پێی فەرموو : (قەڵغانەکەت دابنێ بۆ کەسێك کە شەر ئەکات).

پیاوەکە قەڵغانەکەی داناو ڕۆیشت.

قەڵغانەکەم گرت بەڕووی پێغەمبەری خواوە(درودی خوای لەسەر بێت) جگە لەوەش بەشمشێر بەرگریم لێ ئەکرد و بەکەوانیش تیرم ئەهاویشت هەتا برین بێ هێزی کردم .

ئەو کاتەی ئێمە لەوانەدا بووین (إبن قەیئمە) وەکو وشتری یاخی هات و هاواری کرد موحەممەد لەکوێیە ؟ پێم بڵێن لەکوێیە؟ من و موصعەب ڕێمان لێگرت بەشمشێرەکەی دای لە موصعەبی کوڕی عومەیرو شەهید کرد.

ئینجا کەوتە لێدانی من لەدواوە شمشێرێکی لەدەفەی شانمدا برینێکی قووڵی تێکرد، منیش چەند جارێك لێم دا بەڵام ئەو دوژمنی خوایە دوو قەڵغانی لەبەردا بوو .

نوسەیبەی مازنی بەردەوام ئەبێت و ئەڵێت :لەو کاتەدا کوڕەکەم بەرگری لەپێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) ئەکرد یەکێك لە موشریکەکان بەشمشێر لێ ی دا زۆری نەمابوو قۆڵی لێ بکاتەوە .

خوێن لەبرینی قوڵی هەڵ ئەقولا، چووم بۆ لای برینەکەیم پێچاو پێم ووت: هەستە کوڕم شمشێر بازی بکە لەگەڵیان........

پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) سەیرێکی کردم و فەرمووی: (کێ بەرگەی ئەوە ئەگرێت کە ئێوە بەرگەی ئەگرن ئەی ئوم عومارە) ، ئینجا ئەو پیاوە هات کە

شمشـێرەکەی لەکوڕەکـەم دابـوو پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسەر بێت) فەرمووی: (ئەمە ئەوەیە کەلە کوڕەکەتی دا ئەی ئوم عومارە)، زۆری نەخایاند گەیشتمە سەری و ڕێگەم پێ گـرت بەشمشـێر دام لەقاچـی کەوتـە سـەر زەوی ئینجـا بـە شمشێر یەك لەدوای یەك لێمان ئەداو ڕممان پیا ئەکرد هـەتا مرد .

پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) سەیری کـردم زەردەخەنەیەکی کـردو فـەرموی: (ئـەی ئوم عومارە تۆڵـەت لێ سـەند سـوپاس بـۆ ئـەو خوایـەی زاڵـی کـردی بەسـەریدا و بەچاوی خۆت تۆڵەسەندنەوەی خۆتت بینی) .

کوڕەکانی ئوم عومارە لەئازایـەتی و تێکۆشـاندا لـەدایك و باوکیـان کـەمتر نـەبوون هـەروەها لـە قوربانیـدان و خۆبەخشینیشدا لەخوار ئەوانەوە نەبوون .

کوڕ دڵخۆشـکەری دایـك و باوکیـان و وێنـەی ڕاسـتەقینەی ئەوان بوون .

عبدالله ی کوڕی ئەگێڕێتەوە و ئـەڵێت : لەگـەڵ پێغەمبـەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) ئامادەی شەڕی ئوحود بووم،

کاتێك خەڵکەکە بەجێیان هێشت من و دایکم چوین بەرگری لێ بکەین .

پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی : (تۆ کوڕی ئوم عومارەیت) .

وتم : بەڵێ

فەرمووی: (بهاوە) واتە بەرد بهاوە بەرەو ڕوی دوژمنەکان.

پیاوێکی موشریك لەبەردەمیدا بوو دەستمکرد بە بەردبارانکردنی پیاوەکە کەوتە سەر زەوی، بەردەوام بەردم پیا ئەکێشا هەتا لەکۆڵی بۆوە، پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) سەیری ئەکردم زەردەخەنەی ئەکرد .

ئەوسا ئاوڕی دایەوە برینەکەی شانی دایکمی بینی خوێنی لێ ئەڕژا فەرمووی: (دایکت ... دایکت ... برینەکەی دایکت بپێچە . خوای گەورە بەرەکەت بڕێژێ بەسەر خێزانەکەتاندا پایەی دایکت لە پایەی فلان و فلان... چاکترە خوا ڕەحم بەخێزانەکەتان بکات) .

دایکم تەماشای پێغەمبەری خوای کردو ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا دوعامان بۆ بکە هاوڕێیەتیت بکەین لەبەهەشتدا .

پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: (خوایە بیانکەیت بەهاوڕێم لەبەهەشتا).

دایکم وتی: دوای ئەمە هەرچی بەسەرما بێت لەدونیادا بەلامەوە گرنگ نی یە.

پاشان ئوم عومارە لە ئوحود گەڕایەوە بەو برینە قوڵەی شانیەوە و بەو دوعایەوە کە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت ) بۆی کرد .

پێغەمبەری خواش (درودی خوای لەسەر بێت) لە ئوحود گەڕایەوە و ئەیفەرموو: (ڕۆژی ئوحود بەلای ڕاست و چەپدا ئاوڕم نەدایەوە نەم بینیبێت ئوم عومارە بەرگریم لێ ئەکات) .

ڕۆژی ئوحود ئوم عومارە مەشقێکی ووردی لەسەر شەڕکردن کرد .

هەروەها شیرینی شەڕکردنی لەپێناوی خوادا چەشت چی ترنەی ئەتوانی ئارام بگرێت .

خـوای گـەورە نوسـيبوی لەسـەری کـە لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا (درودی خـوای لەسـەر بێـت) زۆرتـرین دیمەنـەکانی جەنگ ببینێت .....

ئـەوەبوو لەحودەیبیـە لەگـەڵی ئامـادە بـوو هـەروەها لـە خەیبـەر و لـە عـەمرەی دوای ڕێکەوتننامـەی حودەیبیـە و لـە حونەیین و لەپەیمانی رضوان .

بەڵام هەموو ئەمانە هیچ نین ئەگەر بەراورد بکرێن لەگەڵ ڕۆژی (یەمامە) کەلەسەردەمی ئەبو بەکری صدیقدا ڕووی دا خوای گەورە لەهەردوکیان ڕازی بێت .

چـیرۆکی ئـوم عومـارە لەگـەڵ ڕۆژی (یەمامـە) دەسـت پێـدەکات لەسـەردەمی پێغەمبـەری خـوادا (درودی خـوای لەسـەر بێـت) کاتێك پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێت) نامەیەکی بەکوڕەکەیدا کە حەبیبی کوڕی زەید بوو نارد بۆ موسەیلەمەی درۆزن .

موسـەیلەمە ناپـاکی لەگـەڵ حـەبیب کـرد و بەکوشـتنێك کوشتی کە پێست بە باسکردنی هەڵدەقرچێت .

ئەویش ئەوە بوو کە موسەیلەمە حەبیبی بەستەوەو ئینجا پـێی ووت: ئایـا شـایەتی ئـەدەیت کـە محمـد پێغەمبـەری خوایە؟ ووتی : بەڵێ .

موسـەیلەمە ووتـی: شـایەتی ئـەدەیت کـەمن پێغەمبـەری خوام؟

حەبیب ووتی: گوێم لێ نەبوو چیت ووت .

پارچەیەکی لەلەشی بڕی .

ئینجـا موسـەیلەمە بـەردەوام پرسـیارەکەی دووبـارە ئەکردەوە ئـەویش هـەمان وەڵامـی ئەدایـەوە بـەبێ ئـەوەی یـەك وشەی لێ زیاد و کەم بکات .

موسەیلەمەش هەموو جارێك پارچەیەکی لەلەشـی ئەبڕی هەتا گیانی پاکی دەرچوو دوای ئەوەی کە ئازارێکی چەشـت کـە بـەردی ڕەق بەرگـەی نەئـەگرت، هـەواڵی مردنـی حـەبیبی کـوڕی زەیـد هاتـەوە بـۆ دایکـی (نوسـەیبەی مـازنی) هیچـی نەکرد تەنیا ئەوە نەبێت وتـی: بۆ هەڵوێستێکی ئاوا ئامادەم کردبوو.

وای دا ئەنێم کەلای خواوەیە و داوای پاداشت لەو ئەکەم حەبیب پەیمانی دا بەپێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) شەوی عەقەبە کاتێك منالْ بوو، ئەمڕۆ کە گەورە بوو بەڵێنەکەی هێنایەدی .

ئەگەر خوای گەورە بمگەیەنێتە لای موسەیلەمە ئەبێت وابکەم کچەکانی ڕوومەتی خۆیانی بۆ بڕنن.

زۆری نەخایاند ئەو ڕۆژەی کە نوسەیبە بە ئاواتیەوە بوو هاتە پێش .

ئەوە بوو بانگبێژی ئەبوبەکری صدیق لەشاری مەدینە بانگی دا کە ئەڕۆن بۆ شەڕی موسەیلەمەی درۆزن، موسڵمانەکان ڕۆیشتن و بەگورجی هەنگاویان ئەنا بۆ گەیشتن بەدیداری، لەسوپاکەدا ئوم عومارەی تێکۆشەری نەبەرد و کوڕەکەی عبدالله ی کوڕی زەید هەبوو .

کاتێك بەیەك گەیشتن و شەڕەکە بڵێسەی سەند چەند کەسێك لەموسڵمانەکان خۆیان بۆ موسەیلەمە تەرخان کردبوو لەوانە ئوم عومارە کە دەیویست تۆڵەی کوڕی شەهیدی بستێنێت هەروەها وەحشی کوڕی حەرب کە

لەڕۆژی ئوحود حەمزەی کوشت دەیویست کاتێك ئیمانی هێناوە خراپترین کەس بکوژێت، چونکە کاتێك بێباوەڕ بوو یەکێك لەچاکترین کەسی کوشت .

ئوم عومارە نەیتوانی بگاتە موسەیلەمە لەشەڕەکەدا قۆڵێکی بڕاو بیَ هێز و لاوازی کرد .

بەڵام وەحشی کوڕی حەرب و أبادوجانەی خاوەنی شمشێری پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) گەیشتنە سەر موسەیلەمە و بەیەکەوە لێیان دا .

وەحشی نوکی ڕمەکەی پیادەکرد و ئەبودوجانەش بەشمشێر لێی ئەدا لە چاوتروکانێکدا کەوتە سەر زەوی .

ئوم عومار دوای (یەمامە) گەڕایەوە مەدینە بەیەك دەستەوە تاقە کوڕەکەی لەگەڵدا بوو .

بەڵام دەستەکەی تری وای دانا کە لەپێناوی خوایەو داوای پاداشتی لای خوا ئەکرد وەك چۆن پێشتر بۆ کوڕە شەهیدەکەی هەروای کرد

بۆچی وای دانانێت ؟!

ئـەی بەپێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێـت)ی نەوت: دوعامان بۆ بکە لەبەهەشتا هاوڕێت بین؟! پێغەمبـەری خواش (درودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی: (خوایە بیان کە بەهاوڕێم لەبەهەشتا) .

ئوم عومارە ووتی: پاش ئەمە بەلامەوە گرنگ نی یە چی لەدونیا بەسەرمابێت .

خـوای گـەورە لـە ئـوم عومـارە خـۆش بێـت، بەڕاسـتی جۆرێکی بێ هاوتا بوو لەناو ئافرەتانی ئیمانداراندا .

وە نموونەیـەکی تـاك بـوو لـەنێو ئافرەتـە تێکۆشـەر و ئارامگرەکاندا ..

## ﴿ڕەملەی کچی ئەبو سفیان﴾

((ئوم حەبیبە شوێن فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا کەوت و پێی ناخۆش بوو بگەڕێتەوە بۆ بێباوەڕی وەك چۆن کەسێك پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە ناو ئاگر)) (مێژوو نوسان)

بەبیری ئەبو سوفیانی کوڕی حەربدا نەئەهات کەسێك لەقوڕەیشیەکان لەفەرمانی ئەو دەربچێت، یان لە کارە گەورەکاندا لەڕێی ئەو لابدات.

ئەو گەورەی گوێ لێ گیراوی مەککە بوو .

وە سەرکردەیەك بوو خەڵکی بەدڵسۆزیەوە فەرمانەکانیان جێبەجێ دەکرد و پشتگیرییان دەکرد .

بەڵام ڕەملەی کچی کە ناسرابوو بە ئوم حەبیبە درزی کردە ئەم سەرکردایەتیە و پوچەڵی کردەوە کاتێك بەرامبەر خواکانی باوکی بێباوەڕ بوو، وە خۆی و مێردەکەی عبدالله ی کوڕی جەحش باوەڕیان هێنا بەخودای تاك و تەنهاو پەیامەکەی پێغەمبەرایەتی محمدی کوڕی عبدالله یان بەڕاست دانا .

ئەبوســوفیان بەهــەموو هێــزو توانایــەکی هــەوڵی دا کــە کچەکەی و زاواکەی بگێڕێتـەوە بـۆ سـەر ئـاینی خـۆی و بـاو باپیرانی بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، چونکە ئەو ئیمانـەی لـەدڵی ڕەملـەدا ڕەگـی داکوتـابوو زۆر قـوڵتر بـوو لـەوەی ڕەشـەبای ئەبوسوفیان بتـوانیّ هـەڵی بکـەنێت، ڕەملـە کۆڵی نـەداو ڕق و تورەیی ئەبوسفیانی جوڵاند .

ئەبوسوفیان خـەمی بەسـەرا بـاربوو بـەهۆی موسـڵمانبونی ڕەملـەوە، نـەی ئـەزانی بـەچ شـێوەیەك ڕوبـەڕوی قـوڕەیش ببێتەوە کە ناتوانێت کچەکەی بهێنێتـە ژێـر ڕکێفی خۆیـەوە و دوای محمد نەکەوێت .

کاتێـــك قـــوڕەیش زانییـــان ئەبوســـفیان لەڕەملـــە و هاوسـەرەکەی تورەیـە، زاتـی ئـەوەیان کـرد بچـێت بەگژیانـدا دەستیان کرد بەتـەنگ پـیّ هـەڵ چنینیان، بەتونـدترین شـێوە ئەیان ترساندن هەتا ئیتر نـەیان تـوانی لەمەککـە ژیـان بەسـەر بەرن .

ئـەو کاتـەی پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێـت) ئیزنی موسڵمانەکانی دا کۆچ بکەن بۆ (حەبەشە) .

ڕەملـەی کچـی ئەبوسـفیان و کچـە بچـوکەکەی کـەناوی حەبیبە بوو لەگەڵ هاوسەرەکەی عبداللە ی کوڕی جەحش لەو کۆمەڵـە موسڵمانەبوون کـە بەدینەکەیانـەوە کۆچیان کـرد بـۆ ژێر سایەی (نەجاشی) تاکو پارێزگاریان لێ بکات .

بـەڵام ئەبوسـفیان و ئەوانـەی لەگەڵیـدا بـوون لەسـەرانی قـوڕەییش بەلایانـەوە قـورس بـوو ئـەم کۆمەڵـە موسـڵمانە لەدەسـتیان دەربچـن و لـەوڵاتی حەبەشـە تـامی حەسـانەوە بچێژن.

نێردراویـان نـارد بـۆ لای نەجاشـی تـاکو هـانی بـدەن کـە موسڵمانەکانیان تەسلیم بکاتەوە بەنەجاشیان ووت کـە ئـەوان بەخراپە باسی مەسیح و مەریەمی دایکی دەکەن.

نەجاشـی نـاردی بـەدوای سـەرکردەکانی کۆچـەرەکاندا و لەبارەی ڕاستی دینەکەیان و ئەو قسانەی بەعیسـی ی کـوڕی مریەم و دایکی دەڵێن پرسیاری لێکردن، وە داوای لێیکـردن کە هەندێك لەو قورئانـەی بۆ بخوێننەوە کە هاتۆتە خـوار بـۆ سەر دڵی پێغەمبەرەکەیان .

کاتێك ڕاستی ئیسلامیان بۆ باسکرد و هەندێك ئایەتی قورئانیان بۆ خوێندەوە نەجاشی دەستی کرد بەگریان هەتا ڕیشی تەڕ بوو .

ئینجا پێی وتن: ئەوەی کە هاتۆتەخوار بۆ پێغەمبەرەکەتان محمد و ئەوەی کە عیسا هێناویەتی لەیەك سەرچاوەی ڕوناکیەوە هاتوون .

پاشان باوەڕهێنانی خۆی ئاشکرا کرد بەخوای تاك و تەنها و وە بەپێغەمبەرایەتی محمد (درودی خوای لەسەر بێت) هەروەك ئاشکرای کرد کە پارێزگاری لەهەر موسڵمانێك دەکات کە کۆچبکات بۆ وڵاتەکەی .

لەگەڵ ئەمانەشدا گەورە لێپرسراوەکانی ڕازی نەبوون موسڵمان بن و لەسەر گومڕایی لەئایینی مەسیحیدا مانەوە .

ئوم حەبیبە وای دانا دوای ئەو هەموو گرژی و ئاڵۆزیە دنیای بۆ تەخت بووە وگەشتی ڕێگای پڕ ناڕەحەتی و ئازار گەیاندویەتیە دەشتی ئارامی و دڵنیایی ....

بەڵام نەیئەزانی چارەنوسەکان چییان بۆ حەشارداوە .

خوای گەورە و باڵادەست حیکمەتی وا بوو کە ئوم حەبیبە تاقیبکاتەوە بەتاقیکردنەوەیەکی زۆر قورس کە پیاوانی ئاقڵ و ژیر تیایا ژیریەکەیان وێڵ ئەکرد، وە پیاوانی خاوەن بلیمەتی و تێگەیشتن لەبەردەم ئەم تاقیکردنەوەدا بلیمەتی و تێگەیشتنەکەیان دەڕووخا و هەرەسی دەهێنا .

وە ئەگەر لەم بەڵا گەورەیە دەربچێت و زاڵ بێت بەسەریدا ئەوا لەسەر لوتکەی سەرکەوتن دائەنیشێت .

شەوێك ئوم حەبیبە چووە ناو جێگەکەی و خەوی لێ کەوت لەخەودا بینی کە هاوسەرەکەی عبداللە ی کوڕی جەحش کەوتۆتە ناو دەریایەکی قوڵەوە ئاوی دەریاکە گێژی ئەیات و تاریکی بەسەردا دێت و شەپۆلی دەریاکە یەك لەدوای یەك نوقمی ئەکات هاوسەرەکەی بینی کە لەخراپترین حاڵدا بوو.

ئوم حەبیبە لەخەو ڕاپەڕی و ترس و پەشۆکاوی دایگرت نەی ویست خەوەکەی نە بۆ هاوسەرەکەی و نە بۆ هیچ کەسی تر باس بکات .

بـــەڵام خەوەكـــەی زۆری نەخایانـــد هاتـــەدی ... ڕۆژی ئەوشـەوە ڕەش وبەدبەختیە تەواو نەبوو كەعبداللە ی كوڕی جـەحش لـەئاینی ئیسـلام هەڵگەڕایـەوە و چوەسـەر دینـی مەسیح و بوو بە نەصرانی پاشان ڕوی كردە مەیخانەكان و دەستی كرد بەخواردنـەوەی ئارەق كەعـەرەب پێـی ئـەڵێن (أم الخبائـث ) واتـە دایكـی پیسـەكان ئەمـەش لەبەرئـەوەی سەرچـــاوەی هـــەموو خراپەیەكــــە هۆگر(مـــــدمن)بوو بەخواردنـەوەی ئارەق بـەجۆرێك كـەتینوێتی و برسێتی لێـی نەئەشـكا، هاوسـەرەكەی دوو ڕێگـای بـۆ ئـوم حەبیبـە دانـا كەهـەردوكیان زۆر تـاڵ و سـەخت بـوون ئـەویش ئـەوەبوو ... یان تەڵاقی ئەدات یان ئەبێت ببێـت بەنەصرانی لەناكاو ئوم حەبیبـە خـۆی لـەنێوان سـێ ڕێگـا دا دۆزیـەوە : یـان ئـەوەی بەقسەی هاوسەرەكەی بكات و بچێتە سەر ئاینی نەصرانی و بەمـەش لەئاینەكـەی خـۆی پاشـگەز ئەبێتـەوە كەدەبێتـە هـۆی شـەرمەزاری دنیـا و سـزای دواڕۆژ ـــ پەنابـەخوا ـــ ئەمـەش كارێك بوو ئوم حەبیبە نەیئـەكرد هـەتا ئەگـەر بەشـانەی ئاسن گۆشتی لەئێسقان بكەنەوە ... یان بگەڕێتـەوە بۆماڵی بـاوكی

لەمەککـە کـەتا ئەوکاتـە قـەڵای بتپەرسـتی بـوو بـە دۆڕاوی و ژێردەسـتـەیی لەسـەر دینەکـەی بمێنێتـەوە یـان لـەووڵاتی ((حەبەشە)) تەنیاو دەربەدەر بمێنێتەوە بێکەس وبێ وڵات و بێسەرپەرشـت لەگـەڵ هـەموو ئەمانـەدا ڕازیبـونی خـوای پـەروەردگار ی هەڵبـژارد و بڕیـاری دا لەحەبەشـە بمێنێتـەوە هـەتا خـوای گـەورە دەرگـای لـێ ئەکاتـەوە، چاوەڕوانی ئوم حەبیبـە زۆر درێـژەی نەکێشـا هاوسـەرەکەی لەپاشـی چـونە سەرئاینی نەصرانی زۆر نەژیا کەمێك پاش تەواوبونی عدەی شەرعی خوای گەورە دەرگای خێر و خۆشی لێ کردەوە بەبێ دیاریکردنی کـاتێکی تایبـەت بەختـەوەری هـات و بـە دوبـاڵی زمروتی سەوزەوە لەسـەر ماڵـە خەمبارەکەی باڵـەفڕەی دەکـرد ئـەو بەیانیـە تیشـیکێکی زیـوین ڕوخسـاری گەشـاندەوە لـە دەرگاکـــەی درا کاتێـــك کردیـــەوەبینی کـــە (ئەبرەهـــە)ی خزمەتکاری تایبەتی نەجاشی پادشای حەبەشـەیە بەڕویـەکی مژدەبـەخش و بـەڕێزەوە سـڵاوی لێکـرد و داوای لـێ کـرد ڕێگەی بدات بچێتە ژورەوە، ئەویش ڕێگەی دا.

ئەبرەهــە وەتــی : پادشــا ســەلامت لێئــەکات و ئــەڵێت : پێغەمبـەری خـوا محمـد (د.خ) ئەیـەوێت لـەخۆیت مـارە بکات پادشا نوسراوێکی بەمندا ناردووە کەبوە بە وەکیل تا مارەی تۆ ببڕێت تۆش هەرکەسێك کەپێت خۆشە بیکە بە وەکیل ئوم حەبیبـە خـەریك بـوو لەخۆشـیا بـاڵی ئـەگرت هـاواری کـرد : خوامژدەی خێرت بداتیّ دەستی کرد بەلێکردنەوەی خشلّ و ئاڵتونەکانی بازنگەکانی داکەند و بەخشـی بـە ئەبرەهـە ئینجا پاوانەکـەی و گوارەکـانی و مسـتیلەکانی وە ئەگــەر هــەموو سامانی دنیا هی ئەوبوایە لەوکاتەدا ئەیبەخشی بەئەبرەهە.

ئینجا ئوم حەبیبـە وتـی : خالیـدی کوڕی سعیدی کوڕی عاص ئەکەم بەوەکیل ئەو نزیکترین کەسی منە .

لەکۆشــکی نەجاشــی، لــەباخێك لەباخــە گەشــاوەکانی حەبەشە .

وە لەیــەکێك لەهۆڵەفراوانــەکانی کەبەنەخشــی بریقــەدار ئارایشــت درابـوو وە بەچـرای زەیتـی ڕونـاك کرابـۆوە و بـە فەڕشی گرانبەها و نایاب داپۆشرابوو .

ئـەو هاوەڵـە بەڕێزانـەی کەلـە حەبەشـە ...

کۆبوونەوە لەسەروی هەموویانەوە جەعفەری کوڕی ...

و خالیـدی کـوڕی سـەعیدی کـوڕی عـاص و ...

حوزافەی سـەهمی و چـەند کەسێکی تـر ئامادە...

ئـوم حەبیبـەی کچـی ئەبوسـفیان بـوون بـۆ ...

(درودی خوای لەسەر بێت) .

کاتێـــک هـــەموویان کۆبونـــەوە نەجاشـــی ...

دانیشـتنەکەو ووتـی: سـوپاس بـۆ خـوای ...

کراوی بەهێزی زەبر بەدەست شایەتی ئەدەم ...

تەنهایـــە و محمـــد بەنـــدە و ڕەوانـــەکراوی ...

پێغەمبەرەیە کە عیسای کوڕی مریەم مژدەی ...

دوای ئەوە: پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسەر ...

داوای لـەمن کـردووە کـە ئـوم حەبیبـەی کچـی ئەبوسفیان ...

مارەبکـەم، منـیش وەڵامـی داواکـەیم دایـەوە ...

بەمارەیی چوار سـەد دینـاری ئاڵتون لەسـەر سـوننەتی ...

پێغەمبەری خـوا مـارەم کـرد ئینجـا دینـارە ئاڵتونـەکانی ...

دەستی خالیدی کوڕی سەعیدی کوڕی عاص .

لێرەدا خالید هەستاو وتی: سوپاس و ستایش بۆ خوا پەنا بەو ئەگرم داوای تەوبەو لێ خۆشبونی لێ ئەکەم، وە شایەتی ئەدەم کە محمد بەندە و ڕەوانەکراوی ئەوە بە ئاینی ڕاست و ڕێ نیشاندەر تاکو بەسەر هەموو ئاییینەکانی تردا بەهێزو سەرکەوتو بێت هەتا ئەگەر بێباوەڕانیش پێیان ناخۆش بێت.

پاشان وەڵامی داواکەی پێغەمبەری خوام دایەوەو ئوم حەبیبەی کچی ئەبوسفیانم لێ مارەکرد بەوەکالەت پیرۆز بێت لەپێغەمبەری خواو هاوسەرەکەی پیرۆزبایی لەئوم حەبیبە بۆ ئەو خێرەی خوا بەنسیبی کرد .

ئینجا پارەکەی هەڵگرت تاکو بیبات بۆ ئوم حەبیبە، هاوەڵەکانیشی هەستان تاکو بڵاوەی لێبکەن.

نەجاشی وتی: دانیشن سووننەتی پێغەمبەران وایە بۆ ژن هێنان خواردن ئەکەن .

بانگی خواردنی بۆ کردن، نانیان خواردو ڕۆشتن، ئوم حەبیبە ئەڵێت : کاتێك پارەکەم پێگەیشت پەنجا مسقاڵ ئاڵتونم لێ نارد بۆ ئەبرەهە کە مژدانەی پێدام .

وتم پێی بڵێن: من ئەو ڕۆژە هەر ئەوەم هەبوو کە پێمدا ئەم ئاڵتونە بۆ ئەوە لەبری مژدانە .

زۆری پێ نەچوو ئەبرەهە هات بۆ لام و ئاڵتونەکەی بۆ هێنامەوە قوتویەکی پێ بوو ئەو خشڵانەی تێدابوو کە پێمدا بوو وتی: پاشا پێیووتم کە نابێت هیچ شتێك لەتۆ وەربگرم وە فەرمانیشی بەژنەکانی کردوە هەرچی بۆنی خۆشیان هەیە بۆت بنێرن .

ڕۆژی دواتر هات بۆ لام زەعفەران و عود و عەنبەری بۆ هێنابووم پاشان پێی وتم: ئیشێکم بە تۆ هەیە ووتم : چی یە؟

ووتی: من موسڵمان بووم و شوێن محمد کەوتوم سلاوی من بگەیەنە بە پێغەمبەری خواو پێی بڵێ کە من بڕوام بەخواو بەپێغەمبەرەکەی هێناوە ئەمەت لەبیر نەچێت ئینجا کەلوپەلەکانی بۆ پێچامەوە.

منیش کەلوپەلەکانم هەڵگرت و ڕۆیشتم بۆ لای پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) .

کاتێـك بـە پێغەمبـەری خـوا گەیشـتم باسـی چـۆنیەتی مارەبڕینەکـەو ئـەوەی ئەبرەهـە کـردی بـۆم گێڕایـەوە و سڵاوەکەیشم پێ گەیاند .

پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێـت) بەهەواڵەکـە دڵخـۆش بـوو فـەرمووی: (سـڵاوو ڕەحمـەت و بەرەکـەتی خـوا لەئەو). واتە ئەبرەهە.

## ﴿غومەیصائی کچی ملعان﴾

## ناسراو بە ئوم سولەیم

((هەرگیز نەمانبیستوە مارەیی ئافرەتێك لەمارەییەکەی ئوم سولەیم بەڕێزتر و گەورەتر بێت کە مارەییەکەی ئیسلام بوو)) {دانیشتوانی مەدینە}

کاتێك ئاینی ئیسلام بەڕوناکیەکەی سەرزەوی ئاوەدانکردەوە غومەیصائی کچی ملعان تەمەنی نزیکەی چل ساڵ و نیو بوو غومەیصاء هەموو بۆشاییەکانی ژیانی هاوسەرەکەی کە مالیکی کوڕی نەضر بوو پڕ کردبۆوە وە لەسایەی ئەوین و سێبەری خۆشەویستی ئەودا ژیانی ئاسودەو گەشاوە بوو بوو.

پیاوانی (یەثریب) خۆزگەیان پێ دەخواست کە خێزانەکەی بەژیریە پەسندەکەی و دوربینیەکەی و گوێ ڕایەڵی کردن بۆی ژیانێکی بەختەوەری بۆ دەستەبەر کردووە.

لەرۆژێك لەرۆژە نەمرەكانی خوای پەروەردگاردا لەگەڵ بانگخواز موصعەبی كوڕی عومەیر یەكەم تیشكی هیدایەتی محمدی بەناو شاری (یەثریب) دا گوزەری كرد.

دڵی غومەیصاء بۆ ئاینی ئیسلام كرایەوە وەك چۆن گوڵی باخەكان بۆ بەرەبەیان ئەكرێنەوە .

زۆری نەخایانـد غومەیصاء ئیسلامەكەی ئاشكراكرد ئەوكات موسڵمانانی مەدینە بەپەنجەی دەست هەژمار ئەكران پاشان هاوسەری بەوەفا هاوسەری ئازیزی بانگكرد كەلەم سەرچاوە شیرین و پاكە بخواتەوە وە لەگەڵیداو ئەویش وەكو ئەو تامی ئەو خۆشیەی ئیمان بكات .

بەلام مالیكی كوڕی نەضر دڵی بۆ ئەم ئاینە تازەیە نەكرایەوە و دەروونی خۆی پێ پاك نەكردەوە بەڵكو داواشی لە غومەیصاء ئەكرد لەئیسلام پاشەگەز ببێتەوە و بگەڕێتەوە سەر دینی باوباپیرانی، هەردو هاوسەر پابەند بوون بەهەڵوێستی خۆیانەوە.

غومەیصاء پێی ناخۆش بوو بگەڕێتەوە بۆ بێباوەڕی وەك چۆن كەسێك پێی ناخۆشە فڕێ بدرێتە ئاگرەوە،

مـاليكيش بەكەللـەڕەقی خـۆی لەسـەر دینـی بـاو و بـاپیری مایەوە.

غومەیصاء بەڵگـەو نیشانەی ڕوونـی بەدەستەوە بـوو بـۆ بانگکردنی هاوسەرەکەی بۆ ڕێگای ڕاست و ڕونـاك کـە بەڵگـە بێهێـزو لاوازەکـانی هاوسـەرەکەی لەبەرامبەریـدا خۆیـان ڕانەئەگرت .

مالـك بتێکـی لـەدار دروسـت کـراوی هـەبوو کـە لـەبری خـوا ئەیپەرست .

غومەیصاء پێی ئەووت : ئایا تۆ قەدی دارێك ئەپەرستی کـە لەزەویـەك ڕواوە بـەقاچ هـەڵی ئەشێلیت و پاشماوەکـانتی تیا فڕێ ئەدەیت؟!

ئایـا جگـە لـەخوا داوا لەتەختەیـەك ئەکـەیت کـە یـەکێك لەوەستا حەبەشیەکانی شارەکە بۆی دروست کردوویت ؟!

کاتێـك هاوسـەرەکەی نـەیتوانی لـەنرخی بەڵگـەکانی غومەیصـاء کـەم بکاتـەوەو هیچـی پـێ نـەکرا شـارەکەی بەجێهێشت و سەری خۆی هەڵگرت بـەرەو وڵاتـی شام دوای ماوەیەك لەسەر بتپەرستی لەووڵاتی شام مرد .

کــه هــەواڵی بێــوەژن کــەوتنی غومەیصــاء بەشــارەکەدا بڵاوبــۆوە زۆربــەی پیاوەکــان ئاواتــەخواز بــون هاوســەرگیری لەگەڵــدا بکــەن بــەڵام ئەترســان لــەوەی کەبــەهۆی جیــاوازی لەئایینەکەیاندا دەست بەڕویانەوە بنێت .

زەیدی کوڕی سەهل کەناسراوە بەئەبی طەلحە بەهۆی ئـەو پەیوەندیە حزمایەتیەی کە هەیان بوو وە هەردوکیان لەهۆزی بەنی نەجار بوون ئومێدی هەبوو کە غومەیصاء ڕازی بکات .

ئەبوطـەلحە ڕۆیشـت بۆ مـاڵی غومەیصاء و بەنازناوەکـەی بانگی کرد :ئەی ئوم سولەیم هاتووم بۆ خوازبێنیـت هیـوادارم بەدەستی بەتاڵ نەمگەڕێنیتەوە .

غومەیصاء ووتی: سوێند بەخوا ئـەی ئـەبوطـەلحە پیـاوی وەك تــۆ دەســت بەڕوویــەوە نانــدرێت بــەڵام تــۆ پیــاوێکی بێباوەڕیت و منیش ژنێکی موسڵمانم نابێ شوت پێ بکەم .
ئەگەر موسڵمان ئـەبیت ئـەوە مارەییەکـەم بێـت و هـیچ شـتێکم ناوێت جگە لەئیسلام .

ئـەبو طـەلحـە ووتـی: لـێم گـەڕێن بـیری لێ بکەمـەوە پاشـان ڕۆیشت، ڕۆژی دواتر ئەبوطەلحە هاتەوە و وتی: ﴿اشهدُ ان لا إله إلا الله وحده لا شريك له واشهدُ ان مُحمداً عبدُهُ ورسوله﴾. غومەیصـاء ووتـی: ئێسـتا کـە موسڵمان بوویـت منـیش ڕازیـم بتکەم بە هاوسەری خۆم .

ئەمـە وای کـرد خـەڵکی بڵـێن : هـەرگیز نـەمان بیسـتوە مـارەیی ئافرەتێـك لەمارەییەکـەی ئـوم سـولەیم بـەڕێزتر و گەورەتر بێت کە مارەییەکەی ئیسلام بوو .

ئەبوطەلحە ئاسودە و خۆشحاڵ بوو بەهۆی ئەو ڕەوشتە بـەرزو ئاکـارە جوامێرانـەی کـە ئـوم سـولەیم خـۆی پـێ ڕازاندبۆوە، پاشان خۆشی ئەبوطەلحە زیاتر بوو بەوەی کە کوڕێکی لێی بوو کە بووبوە ڕوناکی چاو و خۆشی ناو دڵیان.

بـەڵام کاتێـك ئـەبوطـەلحـە لەخۆئامادەکردنـدا بـوو بـۆ سـەفەرێك منداڵـە بچـووکەکە بـەدەم ئـازاری نەخۆشـییەکەوە ئەینالاَنـد ئـەبوطـەلحـە زۆر بـەزەیی پیاهاتـەوە ئـارامی لێ بـڕا زۆری نەمابوو سەفەرەکەی هەڵبوەشێنێتەوە.

لەکاتی نەبوونی ئەبوطەلحەدا منداڵەکە سیس بوو بوکایەوە جوانی و خۆشیەکەی چووە ژێر خاك .

ئوم سولەیم: بەخزمەکانی وت: هیچ کەس هەواڵی مردنی کوڕەکەی بە ئەبوطەلحە نەدات هەتا خۆم پێی ئەڵێم .

ئەبوطەلحە لەسەفەر گەڕایەوە ئوم سولەیم بەزەردەخەنە و شادی و بەدڵخۆشی و ڕوخۆشیەوە خۆی نیشاندا، ئەبو طەلحە بەپەلە هەواڵی منداڵەکەی پرسی .

ئوم سولەیم ورتی: وازی لێبهێنە ئەو ئێستا ئیسراحەتی کردووە نازانێت کە تۆ هاتویتەوە، پاشان نزیکی عیشابوونەوە ئینجا کەوتە ڕابواردن لەگەڵیدا هەتا خۆشی کەوتە دڵی ئەبوطەلحەوە .

کاتێك زانی ئەبوطەلحە تێری خواردووە و حەساوەتەوە وتی: ئەی ئەبوطەلحە ئەگەر کەسێك شتێك بەئەمانەت بدات بەکەسێك پاشان بیباتەوە ئایا ئەو کەسە ئەتوانێت لێیان بشارێتەوە یان نەهێڵێت بیبەنەوە .

ئەبوطەلحە وتی: نەخێر .

ئـوم سـولەیم ووتـی: خـوای گـەورە ئـەوەی کـە پـێ ی بەخشیبویت بردیەوە وای دابنێ کوڕەکەت لای خوایە (واتە داوای پاداشت لەئەو بکە) .

ئەبوطەلحە: بەمل کەچیەوە ڕازی بوو بەقەضای خوا، بۆ سبەینێ کە ڕۆژ بویەوە ئەبوطەلحە چو بۆلای پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر بێت) باسی هەڵوێستی ئوم سولەیمی بۆ گێڕایەوە.

پێغەمبەری خوا(درودی خوای لەسەر بێت) دوعای بۆ کرد کە خوای گەورە بە منداڵی باشتر جێگەی ئەویان بۆ پڕبکاتەوە، خوای گەورە و مەزن نزای پێغەمبەرەکەی(درودی خوای لەسەر بێت) گیرا کرد و ئوم سولەیم دووگیان بوو، ئەو کاتەی سکی بوو بەنۆ مانگ ئوم سولەیم و ئەبوطەلحەی هاوسەری لەسەفەرێکدا بوون لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (درودی خوای لەسەر بێت) بەرەو مەدینە ئەگەڕانەوە کاتێك لەیەثریب نزیکبوونەوە کاتی منداڵ بونەکەی هات ئەبوطەلحە لەگەڵیدا مایەوە پێغەمبەری بەڕێزیش (درودی خوای لەسەر

بێت) ڕۆیشت و ویستی پێش ئەوەی شەودابێت بگاتە ناو شاری مەدینە.

ئەبوطەلحە چاوی بڕیە ئاسمان و ووتی: ئەی پەروەردگار تۆ ئەزانی کەمن حەز ئەکەم لەگەڵ پێغەمبەرەکەت بم (درودی خوای لەسەر بێت) کاتێك لەشار دەرئەچێت و لەگەڵیدا بم کاتێك ئەگەڕێتەوە بەڵام ئەمەی کە ئەیبینیت ڕێگای لەمن گرتووە .

ئوم سولەیم پێی ووت: ئەی ئەبوطەلحە سوێند بەخوا من بۆ ئەم منداڵە وەك منداڵەکانی پێشوو ئازارم نیە بابڕۆین و لەهاوڕێیەتی پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) دوانەکەوین .

ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە مەدینە لەوێ منداڵەکەی بوو، منداڵەکە کوڕ بوو .

ئوم سولەیم بەو کەسانەی وت کەلەلای بوون: کەس منداڵەکە تێرنەکات هەتا نەیبەین بۆ لای پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) بەیانی براکەی واتە برای منداڵەکە کە ئەنەسی کوڕی مالك بوو بردی بۆ لای

پێغەمبــەری خــوا (درودی خــوای لەســـەر بێــت) کاتێــك پێغەمبــەری خـوا (درودی خـوای لەســەر بێـت) چـاوی پێیـان کەوت فەرمووی: (لەوانەیە ئوم سولەیم منداڵی بوبێت) .

ئەنەس ووتی : بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا .

پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێـت) منداڵەکـەی خستە باوەشـی خۆیـەوە و داوای دەنکێك خورمـای عـەجوەی کـرد کـە (جۆرێك خورمـای ناوەزەیـە لەمەدینـە هەیـە) خسـتیە دەمــی موبارەکیــەوە هــەتا توایــەوە ئینجــا خســتیە دەمــی منداڵەکەوە، منداڵەکە بەزمان دەم و لێوی خۆی ئەلستەوە.

ئینجا دەستی موبارەکی بەسەریدا هێنـاو نـاوی نـا عبـدالله لەنەوەی ئەم منداڵە دە زانای پایە بەرزی ئیسلام هەڵکەوت .

یـــەکێکی تـــر لەســـیفاتەکانی ئـــوم ســـولەیم ئـــەوەبو کەپێغەمبــەری خــوای (درودی خــوای لەســـەر بێــت) زۆر خۆشەویسـت خۆشویسـتنێك کـە لـەناو گۆشـت و ئێسـقانیدا توابــۆوە وە لـــەناخی دڵیـــدا جــێگیر بوبـــو لـــەدەربارەی خۆشەویستی ئوم سولەیم بۆ پێغەمبەری خوا (درودی خـوای لەسـەر بێـت) ئەنەسـی کـوڕی بۆمـان دەگێڕێتـەوەو دەڵێـت :

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) لەماڵی ئێمە خەوتبوو ئەوڕۆژە دنیا زۆر گەرم بوو ئارەق بەناوچەوانی موبارەکیدا ئەهاتە خوار دایکم قاپێکی هێنا بەپەنجە ئارەقەکەی سڕی و کردیە ناو قاپەکەوە.

پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) بەخەبەر هات و فەرموی : (ئەوە چیە دروستی دەکەیت ئەم ئوم سولەیم ؟) ئوم سولەیم ورتی : ئەوە ئارەقی تۆیە کۆیئەکەمەوە و ئەیکەمەناو بۆنەکانمانەوە خۆشترین بۆنی لێدەرئەچێت نمونەی خۆشەویستی ئوسولەیم بۆ پێغەمبەری خوا (درودی خاوی لەسەر بێت) گەلێك زۆرە یەکێکی تر لەو نمونانە ئەنەسی کوڕی قژی پێشەوەی سەری لەسەر ناوچەوانی ئەلەریەوە هاوسەرەکەی ئوم سولەیم حەزیکرد بۆی کورت بکاتەوە چونکە درێژ بووبوو بەڵام ئوم سولەیم نەی هێشت چونکە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) هەموو جارێك کەبەئەنەس ئەگەیشت دەستی بەسەریا ئەهێنا و دەستی بەپەرچەمەکەی دا ئەهێنا کەلەسەر ناوچەوانی ئەلەریەوە تایبەتمەندیەکانی ئوم سولەیم هەرلەوەدا کورت

نەبوبۆوە کە ئیمانداریٚکی دامەزراو، خاوەن ژیرییەکی فراوان، هاوسـەریٚك ودایکیٚـك بیٚـت لەپلـەی یەکەمـدا بـەڵکو لەسـەرو هـەموو ئەمانـەوە تیٚکۆشـەریٚك بـوو لـەپیٚناو دینـی خـوادا . چـەندە سـییەکانی پڕبـوون لـەتۆزی ئەوشـەڕانەی کەبـەبۆنی بەهەشـت بـۆن خـۆش کرابـوون سـەر پەنجـەکانی بـەخویٚنی تیٚکۆشــەرانی ڕیٚگــەی خــوا خــەناوی بــوون برینــەکانی بەدەستەکانی بۆ ئەسڕین و بەبرین پیٚچ بوی ئەپیٚچان چەندە ئاوی ڕژاندە گەروی ئەوکەسانەی کەخۆیان لەپیٚناوی دینـی خوادا بەخت ئەکرد ...

تویٚشـوی بـۆ هەڵئـەگرتن و ... تـیری بـۆ چـاك ئـەکردن ئـوم سولەیم و هاوسەرەکەی ئە بوطةلحه لەشەڕی (ئوحود) لەگەڵ پیٚغەمبـــەری خـــوا (درودی خـــوای لەســـــەر بیٚــــت) بەشدارییانکردووە ئوم سولەیم و عایشەی دایکی ئیمانـداران ڕەزای خوایان لیٚبیٚت بەبیٚ کۆڵنەدان لەسەر پشتیان جەوەنـدە ئاویـان ئـەهیٚناو لـەدەمی موسـڵمانەکاندا بـەتاڵیان ئـەکردەوە هەروەك بەژداری ئوحودی کـردووە ئاواش لەشـەڕی حونـەیین بەشـداری کـردووە لـەڕۆژی حونـەین دا خەنجـەریٚکی بۆخـۆی

هـەڵگرت و کـردی بەبـەر پشـتێنەکەی دا کاتێـك ئـە بـو طلحـە بینی وتی ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە ئوم سولەیمە خەنجەری هەڵگرتووە پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) پـێ ی فەرموو : (ئەوەچییە ئوم سولەیم )

ئـوم سـولەیم وتـی: ئـەوە خەنجـەرە ئـەی پێغەمبـەری خـوا هەتا ئەگەر بتپەرستێك لێم نزیك بۆوە ورگی بدڕم پێغەمبەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێـت) بەقسـەی ئـوم سـولەیم دڵـی خۆش بوو زەردەخەنە گرتی .

لەکۆتـاییدا .

ئایـا گومـان ئەبـەیت کەلەسـەر زەویـدا ژنێـك هـەبێت کـە کامەرانییەکـەی لەکامـەرانی ئـوم سـولەیم زیـاتر بێـت یـان دواڕۆژی لـە دواڕۆژی ئـوم سـولەیم گەشـاوەتر بێـت دوای ئـەوەی کـە پێغەمبـەری خـوا (درودی خـوای لەسـەر بێـت) دەربارەی فەرمووی : (چووە بەهەشتەوە گوێم لـەدەنگی پـێ ی بوو ووتیان ئەوە کێ یە؟!

پێغەمبـەری خـوا پـێ ی فـەرموون : (غومەیصـاء کچـی مـەلحان دایکی ئەنەسی کوڕی مالك) .



# دایکی سەلەمە

# (بێوەژنی عەرەب)



# ﴿دایکی سەلەمە﴾

## (بێوەژنی عەرەب)

((هندی مەخزومی بەتەنیا بەدایکی سەلەمە نەمایەوە بەڵکو بوو بەدایکی هەموو ئیمانداران))

ئوم سەلەمە تۆ نازانیت ئوم سەلەمە کێ یە ؟!

باوکی گەورەیەك بوو لەگەورەکانی هۆزی (مەخزوم) کە لەئایین لایاندابوو وە بەخشندەیەك بوو لەناو ئەو بەخشندە عەرەبانەی کە دیاری کراوبوون، هەتا وابوو کەنازناوی (زادُ الرّاکِب) یان لێ نابوو کە بەواتای توێشووی سوارەکان دێت چونکە ئەو سوارانەی کەبەنیاز بونایە بچنەماڵی ئەو یان لەگەڵیدا بۆ سەفەر بڕۆیشتنایە خواردنیان نەئەبرد .

هاوسەرەکەی عبداللە ی کوڕی الأسَد یەکێکە لەو دە کەسەی کە لەسەرەتای هاتنی ئایینی ئیسلامدا موسڵمان بوون بەجۆرێك کەلەپێش ئەودا تەنها ئەبوبەکری صدیق و ژمارەیەکی کەم کەلەپەنجەی دەست زیاتر نەبوون موسڵمان بوو بوون .

نـــاوی هنـــدی کچـــی ئەبوئومەییـــەی کـــوڕی موغیـــدەی قوڕەیشی یە بەلاّم بەئوم سەلەمە بانگدەکرا دواتر نازناوەکە زاڵ بوو بەسەر ناوەکەی خۆیدا .

ئوم سـەلەمە یـەکێکی تـرە لـەو کەسـانەی کەلـە سـەرەتای هاتنی ئایینی ئیسلامدا لەگەڵ هاوسەرەکەی موسڵمان بوو .

ئـــەوە بـــو کەهـــەواڵی موســـڵمانبوونی ئـــوم ســـەلەمە و هاوسـەرەکەی بلاّوبـۆوە بڵێسـەی قـوڕەیش شـەپۆلی دا داخـی دڵی خۆیانیان بەجۆرێك پیّ ڕشتن کەببنـە پەند و ئامۆژگاری بۆخەڵك، ئازارێك کەبەردی ئەهێنایە لەرزە بەڵام ئەوان نـەلاواز بـون نـەورەیان ڕوخـاو نەپەشـیمان بونـەوە کاتێـك ناڕەحـەتی زۆری بۆهێنـان و پێغەمبـەری خـواش (درودی خـوای لەسـەر بێـت) ڕێگـەی بەهاوەڵـەکانی دا کـۆچ بکـەن بـۆ (حەبەشـە) ئـەمانیش لەدەسـتەی کۆچـەرەکان بـوون ئـوم سـەلەمە و هاوسـەرەکەی ڕۆیشـتن بۆلانـەی ئـاوارەیی و لـەدوای خۆیـان کۆشـکی بـەرزو بڵنـد و پلـەو پایـە و وەجـاخی ڕەسـەنیان لەمەککـە بەجێهێشـت وایـان دانـا کەئەمـە هـەموی لـەپێناوی

خوادایــە و بۆئــەوەی بەسەربەســتی لەتەنیشــت ڕازیکردنــی پەروەردگاردابن.

لەگـەڵ ئـەوەی کـەئوم سـەلەمە و هاوڕێکـانی لەژێرسـایەو پارێزگــاری لێکردنــی نەجاشــی دا (لەبەهەشــتدا بەدیــداری خـوای پـەروەردگار شـادبێت ) حەسـابونەوە کەچـی ئـارەزوی دیـداری مەککـەی شـوێنی دابـەزینی وەحـی وپەرۆشــی بـۆ دیــداری پێغەمبــەری خــوای (درودی خــوای لەســەر بێــت) سەرچـاوەی ڕێنمـایی جـەرگی ئـوم سـولەیم و هاوسـەرەکەی لەت لەت کردبوو پاشان بەردەوام هەواڵ ئەهات بۆکۆچەرەکان لەحەبەشە کەموسڵمانەکان لەمەککە ژمارەیان زیـادیکردووە و بـەهۆی موسـڵمانبونی حمـزەی کـوڕی عبدالمطلب و عومـەری کـوڕی خطـابیشـەوە هێـز و توانایـان زیـادیکردووە و تۆزێـك ئازاری قورەیشیەکانیان لەسەر کـەم بۆتـەوە دەسـتەیەك لـەوان نیازی گەڕانەوە بۆمەککەیان کرد کـەئارەزو پەرۆشـی دیـداری مەککــە و پێغەمبــەری خــوا (درودی خــوای لەســەر بێــت) لەسەربێت پاڵی پێوەنان.

ئوم سەلەمە و هاوسەرەكەی لەو كۆمەڵە بوون كەگەڕانەوە بەڵام كە گەڕانەوە هەرزوو بۆیان ڕونبۆوە كە ئەو هەواڵانەی پێیان گەشتبوو زۆرزیادی پێوە نرابوو وە ئەو هەستانەوەی كە دوای موسڵمانبونی عمر و حمزە موسڵمانەكانی پێ هەستابۆوە لەلایەن قوڕەیشیەكانەوە بەهێرشی گەورەتر وەڵامی درایەوە.

بتپەرستەكان كەوتنە ئازاردان و ترساندن و تۆقاندنی موسڵمانەكان ئەشكەنجەیان ئەدان بەجۆرێك كە لەوەوپێش بەو جۆرە سزایان نەدابوون .

لەوەدا پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) ڕێگەی بەموسڵمانەكاندا كۆچ بكەن بۆ مەدینە.

ئوم سەلەمە و هاوسەرەكەی بڕیاریاندا كە یەكەمین كەس بن كە لەپێناوی دینی خوا كۆچبكەن و لەدەست ئازاری قوڕەیشیەكان ڕزگاریان ببێت.

بەڵام كۆچكردنی ئوم سەلەمە و هاوسەرەكەی سوك و ئاسان نەبوو وەك بیریان لێ كردبۆوە بەڵكو تاڵ و گران بوو

مەرگەساتێکی بەدوای خۆیدا هێنا کە مەرگەساتەکانی تر لەچاو ئەم دا ئاسانتربوون.

با لێگەڕێین بۆ ئوم سەلەمە چیرۆکی مەرگەساتەکەیمان بۆ بگێڕێتەوە ئەو زیاتر هەستی پێ ئەکات وە ڕوونتر وێنای ئەکات و ئەیگەیەنێت ئوم سەلمە ئەڵێت:

کاتێک ئەبوسەلەمە بڕیاری دا کۆچ بکەین بۆ مەدینە حوشترێکی بۆ من ئامادەکرد و خستمیە سەرحوشترەکە و منداڵەکەمان کەناوی سەلەمە بوو گرتمە باوەشم و ڕۆشتین هاوسەرەکەم حوشترەکەی لێ ئەخوڕی و سواری هیچ شتێك نەبوو بوو گوێی نەدایە .

پێشئەوەی دەرچین لەمەککە هەندێك لەپیاوانی هۆزەکەم کە (بەنی مەخزوم) بوو ئێمەیان بینی ڕێگەیان پێ گرتین و بە ئەبوسەلەمەیان ووت :

ئەگەر نەتوانین ڕێگە لەخۆت بگرین ئەی ژنەکەت چی ؟! ئەو کچی ئێمەیە لەبەر چی بهێڵین لێمان بستێنیت و لەولاتی خۆی وەدەری بنێیت.

پاشان هەڵیانکوتایە سەری و بەتەواوی لەیەکیان دابڕین کاتێك هـۆزی هاوسـەرەکەم کـە هـۆزی (بنـو عبـد الاسـد) بـوو بینیـان مـن و منداڵەکـەم ئەبـەن زۆر تورەبـوون و ووتیـان : سوێند بەخوا ناهێڵین کوڕەکە ببەن چونکە ئێوە کچەکەی خۆتان لەکوڕەکەی ئێمە سەندوە ئەو منداڵە کوڕی ئێمەیە و ئێمە بەئەو نزیکترین ئینجا پەلاماری منداڵەکەمیان دا هەریەکەیان بەلای خۆیاندا بەبەرچاوی منەوە ڕایان ئەکێشا هەتا منداڵەکە دەستی لەدەستمان بەربوو بردیان لەچەند ساتێکدا خۆمم بینیەوە پەرت و بڵاو تاك و تەنیا، هاوسەرەکەم بەخۆی و ئایینەکەیەوە بەرەو مەدینە ڕایکرد کوڕەکەم هۆزی (بەنو عبدالاسد) ڕفاندیان لەبن دەستی خۆمدا ڕفاندیان وێران و تێکشکاو .

بەڵام من هۆزەکەم (بەنی مەخزوم) بردیانمە لای خۆیان و خۆیان سەرپەرشتیان ئەکردم .

لەماوەی سەعاتێکدا من و هاوسەرەکەم و کوڕەکەمیان لەیەکتری جیاکردەوە، لەو ڕۆژەوە هەموو بەیانیەك ئەچووم بۆ شوێنی کارەساتەکە دائەنیشتم و وێنەی ئەو ساتانەم

ئەهێنایـــە پـــێش چـــاوی خـــۆم كـــە مـــن و منداڵەكـــەم و هاوســەرەكەمیان لەیـەك جیـاكردەوە بـەردەوام ئـەگریام هـەتا شەوم بەسەردا دەهات .

ســاڵێك یـان نزیكـەی ســاڵێك بـەم شـێوەیە مامـەوە هـەتا ڕۆژێك پیاوێك لەنـەوەی مـامم بەلامـدا تێپـەڕی دڵـی نـەرم بـوو بۆم و بەزەیی پێمدا هاتەوە بەهۆزەكەمی ووت :

ئایـــا ئـــەم بـــێ دەســـەڵاتە بەرەڵاناكـــەن !! لـــە هاوســـەر و منداڵەكەیتان جیاكردۆتەوە .

بـەم جـۆرە لەگـەڵیان خـەریك بـوو هـەتا دڵیـان نـەرم بـوو ســـۆزیان جـــولاّ و وتیـــان : ئەگـــەر ئەتـــەوێت بـــڕۆ بـــۆلای هاوسەرەكەت بەلاّم چۆن بڕۆم بۆ لای هاوسەرەكەم لەمەدینـە و كوڕەكـەم كـە پارچـەیەك لەجگەرمـە لەمەككـە لای هـۆزی نەوەی (عبدالاسد) جێ بهێڵم ؟!

چـۆن بتـوانم ئـەو ئـاگرە دامـركێنم و فرمێسـكی چـاوم وشكبكەمەوە من لەخانەی كۆچ بم و كوڕە بچوكەكەم لەمەككە هیچ هەواڵێكی نەزانم .

ئـەوەبوو هەنـدێك خـەڵك ئـەیانبینیم چ خـەم و پەژارەیـەك ئەچێژم دڵیـان بـۆم نـەرم بـوو قسـەیان لەگـەڵ نـەوەی (بـەنی عبدالأسد) کرد دەربارەی حاڵی من ئەوانیش بـەزەییان پێمـدا هاتـەوە کوڕەکـەمیان دامـەوە، نەمویسـت لەمەککـە بمێنمـەوە هەتا کەسێك بدۆزمەوە لەگەڵیدا کۆچ بکەم .

چونکە ئەترسام شتێکی چاوەڕواننەکراو ڕوبـدات و ببێتـە کۆسپ و دوامبخات لەگەیشتن بەهاوسەرەکەم لەبەرئەوە خێرا وشترەکەم ئامادەکرد و کوڕەکەم کردە باوەشم ڕووە و مەدینـە ڕۆیشتم، هاوسەرەکەم ئەوێت و هیچ بەندەیەکی خوام لەگەڵدا نییە .

کاتێك گەیشـتمە (تـەنمیم) کـە سێ میـل لەمەککـەوە دوورە عوثمانی کوڕی طەلحـەم[٢] پێگـەیشـت وتـی: بـۆ کوێ ئەچیت ئەی کچی (زادُ الرّاکب) ؟

ووتم: هاوسەرەکەم ئەوێت لەمەدینە .

---

٢ ـ عثمان کوڕی طه لحـه دەرگەوانی کەعبه بوو لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلید موسڵمان بـوو پێغەمبەری خوا کلیلەکانی کەعبەی تەسلیم کرد ئەو ڕۆژەی هاوڕێیەتی ئوم سەلەمەی کـرد موشرك بوو .

وتی: ئەی کەست لەگەڵ نیە ؟

وتم: نەخێر سوێند بەخوا تەنها خوا و پاشان ئەم کوڕەم .

وتی: سوێند بەخوا بەجێتناهێڵم هەتا نەتگەیەنمە مەدینە، ئینجا لغاوی حوشترەکەی گرت و لێی خوڕی .

ئوم سەلەمە ئەڵێت: سوێند بەخوا هەرگیز هاوڕێیەتی پیاوێکی عەرەبم نەکردووە لەعوثمانی کوڕی طەلحە بەڕێزتر و بەشەرەفتر بوبێت، کە ئەگەیشتینە شوێنێك لەو شوێنانەی کە بۆحەوانەوە بوو، وشترەکەمی یغ ئەکرد و ئینجا دووردەکەوتەوە و پشتی تیَ ئەکردم هەتا لەسەر پشتی ئەهاتمە خوارەوە لەسەر زەویەکە ڕائەوەستام نزیك ئەبۆوە و کۆپانەکەی لیَ ئەکردەوە و ئەیبرد بۆ بن دارێك ئەیبەستەوە، پاشان لەمن دوورئەکەوتەوە بۆ بن دارێك و لەژێر سێبەرەکەیدا ڕائەکشا کە کاتی ڕۆیشتن ئەهات ئەچوو وشترەکەی ئامادە ئەکرد و ئەیهێنایە پێشەوە ئینجا پشتی تیَ ئەکردم و دوورئەکەوتەوە دەیووت : سواری بە، کاتێك سەرئەکەوتمە سەر حوشترەکە ئەهات لغاوەکەی ئەگرت و لێی ئەخوڕی .

هـەموو ڕۆژێـك بـەو شـێوەیەی لەگـەڵ مـن ئـەكرد هـەتاكو گەیشـتینە مەدینـە كاتێـك گەیشـتینە گونـدێك لـە (قبـاء) كـە گوندی ئەوەی عەمری كوڕی عەوف بوو وتـی: هاوسـەرەكەت لەم گوندەیە بەپشتیوانی خوا بڕۆ بۆ لای پاشان ڕۆیشت و بەرەو مەككە گەڕایەوە.

پەرتــەوازەكان دوای دابڕینێكــی زۆر پێكــەوە كۆبونــەوە چــاوی ئــوم ســەلەمە بەدیــداری هاوســەرەكەی ڕوون بــۆوە ئەبوسەلەمەش بەدیداری هاوسەرەكەی و كوڕەكەی شاد بۆوە ڕووداوەكان زۆر بەخێرایی و لەچاو تروكانێكدا دەستیان پـێ ئەكردو ئەڕۆیشتن.

ئــەوە (بــەدر)و ئەبوســەلەمە ئامــادەی بــوو لەگــەڵ موسڵمانەكان بەسەركەوتنێكی گەورەو ئاشكراوە گەڕانەوە .

ئەوەش (ئوحـود) تیـا گرفتـار بـوو بەچاكترین و پیرۆزتـرین گرفـت، لەشـەڕەكە دەرچـوو بـەڵام بەبرینـداری برینێكـی زۆر قــورس بــەردەوام چارەســەری برینەكــەی ئــەكرد هــەتا وا دەركـەوت كـە برینەكـە سـاڕێژ بـووە بـەڵام برینەكـە لـەڕووی دەرەوە ساڕێژ بوو بـوو لەڕاستیدا لـەناوەوە زۆر خـراپ بـوو

زۆری نەخایاند برینەکە دەمی کردەوەو ئەبوسەلەمەی خستە ناوجێگاوە .

لەو دەمانەی کە ئەبوسەلەمە تیماری برینەکەی بۆ ئەکرا بەهاوسەرەکەی ووت: ئەی ئوم سەلەمە گوێم لەپێغەمبەری خوا بوو (درودی خوای لەسەر بێت) ئەیفەرموو :(هەر کەسێك تووشی کۆسپێك هات و گەڕاندیەوە بۆ لای خوا واتە بڵێت : ﴿إنا لله وإنا اليه راجعون﴾ واتە: ئێمە هەمووممان بۆ خواین و بۆ لای ئەو ئەگەڕێینەوە هەروەها بڵێت خوایە گیان داوای پاداشت لەتۆ ئەکەم خوایە گیان چاکتر لەوەم پێ ببەخشە، ئەوا خوای گەورە پێی دەبەخشێت ) .

ئەبو سەلەمە چەند ڕۆژێك لەناو جێگەی نەخۆشیدا مایەوە، بەیانیەك پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) هات بۆ هەواڵ پرسی .

پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) لەسەردانەکەی تەواو نەبو لەدەرگای ماڵی نەهاتە دەرەوە کە ئەبو سەلەمە گیانی سپارد .

پێغەمبــەری خــوا (درودی خــوای لەســەر بێــت) بەدەســتە پیرۆزەکانی چاوی هاوەڵەکەی لێکنا .

دەستەکانی بـەرزکردەوە بـۆ ئاسمـان و فـەرمووی: (خوایـە گیـان لـە ئەبوسـەلەمە خۆشـببە و پلـەی بـەرز بکـەرەوە بـۆ لای نزیکـانی بارەگـای خـۆت، جێگەکـەی پـڕ بکـەرەوە وە لەئێمـەو ئـەویش خۆشـببە ئـەی پـەروەردگار گۆڕەکـەی بـۆ فـراوان و ڕووناك بکەرەوە) .

ئوم سەلەمە لەبیری مابوو کەهاوسەرەکەی چی بۆگێڕابوٚوە کەلەپێغەمبەری خوا بیستبوی ووتی: خوایـەگیان داوای خێـر و پاداشت لەتۆ دەکەم بەڵام پێی خۆش نـەبوو کەبڵێت خوایە لـەو باشـترم پـێ ببەخشـە چـونکە ئـەی ووت : کـێ ئـەتوانێ لەئـەبوو سەلەمەباشـتربێت بـەڵام زۆری نەخایانـد دوعاکـە بەجێی خۆی گەیشت موسڵمانەکان بۆ کۆستی ئوم سـەلەمە خەمبار بوون بەجۆرێك کە لەوەوپێش بۆ کۆسـتی هـیچ کـەس بەوجۆرە خەمبار نەبوبون ناوی (بێوەژنی عەرەب) یان لـێ نـا چونکە هیچ کەسێکی لە مەدینە نەبوو جگە لە منداڵەکانی کـە وەك زەڕنەقووتە هێشتا باڵیان دەرنەکردبوو .

کۆچەران و یاریدەدەرانیش هەستیان کرد کە حەقی ئوم سەلەمە بەسەریانەوە هەیە .

هێشتا عددەکەی تەواو نەبوو کە ئەبوبەکری صدیق خوازبێنی کرد بۆ خۆی ئوم سەلەمە ڕازی نەبوو جوابی داواکەی بداتەوە .

پاشان عمری کوڕی خطاب چووە پێشەوە هەروەك هاوڕێکەی جوابی ئەویشی دایەوە، ئینجا پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) چوەپێشەوە .

ئوم سەلەمە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا سێ سیفات لەمندا هەیە من ئافرەتێکم زۆر غیرەئەکەم ئەترسم شتێك بکەم توڕەت بکات خوای گەورەش بەهۆیەوە سزام بدات .

وەمن ئافرەتێکم چوومەتە ساڵەوە، وەمن ئافرەتێکی خاوەن منالم .

پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) فەرمووی :

(بۆ ئەو غیرەی کە باست کرد من داوا لەخوای پەروەردگار ئەکەم ئەوە لەتۆدا نەهێڵێت بۆ تەمەنیش ئەوەی کە توشی تۆ

هاتووه توشی منیش هاتووه ئەوەش کە باسی منداڵت کرد منداڵی تۆ منداڵی منه).

پاشان پێغەمبەری خوا (درودی خوای لەسەر بێت) هاوسەرگیری لەگەڵ ئوم سەلەمە کرد، خوای گەورە وەڵامی دوعاکەی ئوم سەلەمەی دایەوە و لە ئەبو سەلەمە باشتری پێ بەخشی .

لەو ڕۆژەوە هندی مەخزومی بەتەنها دایکی سەلەمە نەبوو بەڵکو ئەمڕۆ بوو بەدایکی هەموو ئیمانداران .

خوای گەورە ئوم سەلەمە لەبەهەشتا بەدیداری خۆی شاد بکات و لێ ی ڕازی بێت و ڕازی بکات .

# پێڕست

## لەم کتێبەدا :

- ❖ دایکی شیریی پێغەمبەری نازدار ﷺ حەلیمەی سەعدی
- ❖ صەفیەی کچی عبدالمطلب پوری پێغەمبەری نازدار(ﷺ)
- ❖ ڕیحانەکەی پێغەمبەر (ﷺ) فاطمەی زەهرا
- ❖ خاوەنی دوو پشتێنەکە ئەسمائی کچی ئەبوبەکر
- ❖ نوسەیبەی مازنی
- ❖ ئوم حەبیبە خێزانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)
- ❖ غومەیصائی کچی ملعان ناسراو بە ئوم سولەیم
- ❖ دایکی سەلەمە (بێوەژنی عەرەب)





بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

نرخ: ٣٠٠٠


